


تَأْلِيف

أَبِي بَكْرٍ مُحَمَّدِ بْنِ الحُسَيْنِ بْنِ عَبْدِاللهِ الآجُرِّي

# کتێبی

کتاب الغرباء لإمام الآجری

به کوردی

التاريخ الهجري:

٣/ربيع الأول/١٤٤٣



كتاب

# | الغرباء |

لإمام أهل السنة أبي بكر محمد بن الحسين بن عبدالله والجماعة الآجري ( ٣٦٠ ه )

ناوی کتێب : | كتاب الغرباء |

ژمارەی لاپەڕە : ٩٦

بەروار: ٣ ی ربیع الأول

# بسم الله الرحمن الرحيم

كورتەيەك لە ژيانى ئەم ئيمامە بەرێزە :

ناوى محمدى كوڕى حسين ى كوڕى عبدالله، أبو بكر البغدادي ە، ٣٦٠ ھ وەفاتى كردووە

## مامۆستاكانى :

١) إبراهيم بن موسى، ابو اسحاق الجوزي التوزي (٣٠٣ھـ).

٢) احمد بن الحسن بن عبدالجبار، ابو عبدالله الصوفي البغدادي (٣٠٦ھـ).

٣) جعفر بن محمد بن الحسن، ابو بكر الفريابي (٣٠١ھـ).

٤) عبدالله بن العباس، ابو محمد الطيالسي (٣٠٨ھـ) .

## قوتابيەكانى :

١) احمد بن عبدالله، أبو نعيم الأصبهاني (٤٣٠ھـ)، خاوەنى ﴿ حلية الأولياء ﴾.

٢) خلف بن القاسم بن سهل بن الدّباغ، أبو القاسم الأزدي الأندلسي القرطبي (٣٩٣ھـ).

٣) علي بن محمد بن عبدالله بن بشران، أبو الحسن الأموي مولاهم البغدادي (٤١٥ھـ)

# | باسی ئەو نامۆیە ئیمانداارنە دەکات وە وەسفیان دەکات لەدونیادا وە لەسەر چ حاڵێکدان |

١. حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرٍ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي دَاوُدَ السِّجِسْتَانِيُّ قَالَ :حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ آدَمَ الْمِصِّيصِيُّ قَالَ :حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ غِيَاثٍ , عَنِ الْأَعْمَشِ , عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ , عَنْ أَبِي الْأَحْوَصِ , عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ :قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ» :إِنَّ الْإِسْلَامَ بَدَأَ غَرِيبًا وَسَيَعُودُ كَمَا بَدَأَ غَرِيبًا فَطُوبَى لِلْغُرَبَاءِ «قِيلَ : وَمَنْ هُمْ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ» :الَّذِينَ يُصْلِحُونَ إِذَا فَسَدَ النَّاسُ«

١. ڕسول الله ﷺ ئەفەرموێت : ﴿بەڕاستی ئیسلام بە نامۆیی دەستی پێکرد و دووبارەش نامۆ ئەبێتەوە وەک چۆن سەرەتا دەستی پێکرد، خۆشبەختی بۆ نامۆکان﴾

وترا : ئەوانە کێن ئەی ڕسول الله؟

فەرمووی : ئەوانەی چاکەکارن لەکاتێکدا خەڵکی تووشی خراپی و تێکچوون بوون

٢. أَخْبَرَنَا مُحَمَّدٌ قَالَ :أَخْبَرَنَا أَبُو مُحَمَّدٍ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ صَالِحٍ الْبُخَارِيُّ , وَأَبُو الْعَبَّاسِ أَحْمَدُ بْنُ سَهْلٍ الْأُشْنَانِيُّ قَالَا :حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ، حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ غِيَاثٍ , عَنِ الْأَعْمَشِ , عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ , عَنْ أَبِي الْأَحْوَصِ , عَنْ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ :قَالَ

رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ» :إِنَّ الْإِسْلَامَ بَدَأَ غَرِيبًا وَسَيَعُودُ كَمَا بَدَأَ فَطُوبَى لِلْغُرَبَاءِ «قِيلَ :مَنِ الْغُرَبَاءُ يَا رَسُولَ اللَّهِ ؟ قَالَ " :النُّزَّاعُ مِنَ الْقَبَائِلِ"

٢. رسول الله ﷺ ئەفەرموێت : ﴿بەڕاستی ئیسلام بەنامۆیی دەستی پێکرد، و دووبارە وەک سەرەتای لێدێتەوە، بۆیە خۆشبەختی بۆ نامۆکان﴾.

وترا : نامۆکان کێن ئەی رسول الله؟

فەرمووی : ئەو نامۆیانەی لەناو هۆز و عەشیرەتانێکن کە هۆز و عەشیرەتی خۆیان نیە.

[واتە کەسانێک کە لەپێناو الله تعالی شوێنی خۆیان جێهێشتووە لەسەر سوننەتی رسول الله ﷺ دەڕۆن]

لەکاتێکدا خەڵکی خەریکی خراپەکاریە و سوننەتی گۆڕیوە بەڵام ئەمان لەسەر ئەزیەت دانیان لەلایەن کافران و گومڕایان ئارامیان گرتووە.

٣ . قَالَ أَبُو بَكْرٍ مُحَمَّدُ بْنُ الْحُسَيْنِ وَأَنْشَدَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ حُمَيْدٍ أَبُو بَكْرٍ الْمُؤَدِّبُ فِي مَعْنَى هَذَا الْحَدِيثِ:

بَدَا الْإِسْلَامُ حِينَ بَدَا غَرِيبًا ... وَكَيْفَ بَدَا يَعُودُ عَلَى الدَّلَائِلْ
فَطُوبَى فِيهِ لِلْغُرَبَاءِ طُوبَى ... لِجَمْعِ الْآخِرِينَ ولِلْأَوَائِلْ
كَمَا قَالَ الرَّسُولُ فَقِيلَ :مَنْ هُمْ؟ ... فَقَالَ :النَّازِعُونَ مِنَ الْقَبَائِلْ"

كتاب السلف

٣ . أبوبكر محمد بن الحسين وتى : عبدالله بن حميد أبوبكر المؤدب دەربارەی واتای ئەم حەدیث ە ئەم سروودەی بۆ وتم :

ئیسلام لەسەرەتای دەرکەوتنی بەنامۆیی دەرکەوت
وەک چۆن دەستی پێکرد وەهای لێدێتەوە بەبەڵگەوە

خۆشبەختی بۆ نامۆکان تێیدا خۆشبەختی
بۆ کۆمەڵەکانی سەرەتاکان و کۆتاییەکان

وەک چۆن رسول الله فەرمووی : وترا کێن
فەرمووی نامۆی نێو هۆز و عەشیرەتەکان

٤. أَخْبَرَنَا مُحَمَّدٌ قَالَ ثَنَا أَبُو أَحْمَدَ هَارُونُ بْنُ يُوسُفَ التَّاجِرُ قَالَ :ثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ أَبِي عُمَرَ الْعَدَنِيُّ قَالَ :ثنَا مَرْوَانُ بْنُ مُعَاوِيَةَ الْفَزَارِيُّ , عَنْ يَزِيدَ بْنِ كَيْسَانَ , عَنْ أَبِي حَازِمٍ , عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ :قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ» :إِنَّ الْإِسْلَامَ بَدَأَ غَرِيبًا وَسَيَعُودُ كَمَا بَدَأَ غَرِيبًا فَطُوبَى لِلْغُرَبَاءِ. «

٤. رسول الله ﷺ ئەفەرموێت : ﴿بەڕاستی ئیسلام بە نامۆیی دەستی پێکرد و دووبارەش نامۆ ئەبێتەوە وەک چۆن سەرەتا دەستی پێکرد، خۆشبەختیی بۆ نامۆکان﴾

كتاب السلف

٥ .أَخْبَرَنَا مُحَمَّدٌ قَالَ :حَدَّثَنِي أَبُو حَفْصٍ عُمَرُ بْنُ أَيُّوبَ السَّقَطِيُّ قَالَ :ثنَا مُحَمَّدُ بْنُ الصَّبَّاحِ الْجَرْجَرَائِيُّ قَالَ :ثنَا كَثِيرُ بْنُ مَرْوَانَ , عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ يَزِيدَ الدِّمَشْقِيِّ قَالَ : أَخْبَرَنِي أَبُو الدَّرْدَاءِ , وَأَبُو أُمَامَةَ وَوَاثِلَةُ بْنُ الْأَسْقَعِ وَأَنَسُ بْنُ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ أَجْمَعِينَ قَالُوا :قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ» :إِنَّ الْإِسْلَامَ بَدَأَ غَرِيبًا وَسَيَعُودُ غَرِيبًا فَطُوبَى لِلْغُرَبَاءِ«

٥. رسول الله ﷺ ئەفەرموێت : ﴿بەڕاستی ئیسلام بە نامۆیی دەستی پێکرد، وە دووبارەش نامۆ ئەبێتەوە وەک سەرەتا، بۆیە خۆشبەختی بۆ نامۆکان﴾.

٦. أَخْبَرَنَا مُحَمَّدٌ قَالَ :ثَنَا أَبُو مُحَمَّدٍ يَحْيَى بْنُ مُحَمَّدِ بْنِ صَاعِدٍ قَالَ :ثَنَا الْحُسَيْنُ بْنُ الْحَسَنِ الْمَرْوَزِيُّ قَالَ :أَخْبَرَنَا ابْنُ الْمُبَارَكِ قَالَ :أَخْبَرَنَا ابْنُ لَهِيعَةَ قَالَ :حَدَّثَنِي الْحَارِثُ بْنُ يَزِيدَ , عَنْ جُنْدُبِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ , أَنَّهُ سَمِعَ سُفْيَانَ بْنَ عَوْفٍ الْقَارِيَّ يَقُولُ :سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ يَقُولُ :قَالَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ذَاتَ يَوْمٍ وَنَحْنُ عِنْدَهُ» :طُوبَى لِلْغُرَبَاءِ «قِيلَ :وَمَنِ الْغُرَبَاءُ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ» :أُنَاسٌ صَالِحُونَ قَلِيلٌ فِي نَاسِ سُوءٍ كَثِيرٌ , مَنْ يَعْصِيهِمْ أَكْثَرُ مِمَّنْ يُطِيعُهُمْ«

٦. عبدالله بن عمرو ـ رضي الله عنهما ـ دەفەرموێت : گوێم لە رسول الله ﷺ بوو دەیوت لەڕۆژێکدا کە لای دانیشتبووین : ﴿خۆشبەختیی بۆ نامۆکان﴾

وترا : نامۆكان كێن ئەی رسول الله؟

فەرمووی : ﴿خەڵكانێكی صالحن چاكەكارن ژمارەیان كەمە لەناو خەڵكێكی خراپی زۆر، ئەوانەی سەرپێچییان دەكەن زۆرترن لەوانەی گوێڕایەڵییان دەكەن﴾.

٧.أَخْبَرَنَا مُحَمَّدٌ قَالَ :ثَنَا أَبُو بَكْرٍ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ الْحَمِيدِ الْوَاسِطِيُّ قَالَ: ثَنَا هَارُونُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ :ثَنَا سَيَّارُ بْنُ حَاتِمٍ قَالَ :ثَنَا جَعْفَرُ بْنُ سُلَيْمَانَ قَالَ :ثنَا أَبُو كَعْبٍ الْأَزْدِيُّ قَالَ :سَمِعْتُ الْحَسَنَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ يَقُولُ» :الْمُؤْمِنُ فِي الدُّنْيَا كَالْغَرِيبِ لَا يَجْزَعُ مِنْ ذُلِّهَا وَلَا يُنَافِسُ فِي عِزِّهَا , لِلنَّاسِ حَالٌ وَلَهُ حَالٌ«

٧ .أبو كعب الأزدي وتی : گوێم لە حسن بوو دەیوت : ﴿باوەڕدار لە دونیادا وەک نامۆیەکە، ناترسێ لە کەمی و لاوازبوونەکەی، وە کێبڕکێش ناکات بۆ بەدەسهێنانی رێزەکەی، ئەو بارودۆخێکی هەیە و خەڵکیش بارودۆخێکی تر﴾ .

[واتە حاڵی بەجۆرێکە خۆشی و چێژی دونیای لا گرینگ نییە و کێبڕکی ناکات بۆئەوەی رێز و پلەو پایەی زۆربێت لای خەڵکی، بەشێوەیەک کە بارودۆخەکەی کە تێیدا دەژی زۆر جیاوازە لەگەڵ خەڵکی تر]

٨ .أَخْبَرَنَا مُحَمَّدُ قَالَ :وَأَنْشَدَنِي أَبُو بَكْرٍ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ حُمَيْدٍ الْمُؤَدِّبُ أَيْضًا فِي ذَلِكَ:

وَتَرَى الْمُؤْمِنَ فِي الدُّنْيَا ... غَرِيبًا مُسْتَفَزًّا

فَهُوَ لَا يَجْزَعُ مِنْ ذُلٍّ ... وَلَا يَطْلُبُ عِزًّا

كتاب السلف

وَتَرَاهُ مِنْ جَمِيعِ الْخَلْقِ ... خَلْوًا مُشْمَئِزًّا
ثُمَّ بِالطَّاعَةِ مَا عَاشَ ... وَبِالْخَيْرِ مُلِزًّا

٨. محمد بن الحسين وتى : أبو بكر عبدالله بن حميد المؤدب هەروەها دەربارەى ئەمە سروودى بۆ وتم :

واتە ئیماندار دەبینی لەدونیادا نامۆ و ناڕەحەت كراوە و لەناڕەحەتیدایە
ئەو بە زەلیلی و ئیزعاج نابێت و داوای ڕزگاریش ناكات
وە دەیبینی لەنێوان هەموو خەڵكی كە ڕقیان لێیەتی و بێزراوە
سەرەڕای ئەوانەش بە عیبادەتەوە بۆ الله دەژی و بەخەیر و چاكەوە خۆی ڕزگار دەكات

٩.قَالَ مُحَمَّدُ بْنُ الْحُسَيْنِ رَحِمَهُ اللَّهُ :فَإِنْ قَالَ قَائِلٌ :مَا مَعْنَى قَوْلِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ» :بَدَأَ الْإِسْلَامُ غَرِيبًا وَسَيَعُودُ كَمَا بَدَأَ «؟ قِيلَ لَهُ :كَانَ النَّاسُ قَبْلَ أَنْ يُبْعَثَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَهْلَ أَدْيَانٍ مُخْتَلِفَةٍ , يَهُودٌ وَنَصَارَى وَمَجُوسٌ وَعَبَدَةُ أَوْثَانٍ , فَلَمَّا بُعِثَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ مَنْ أَسْلَمَ مِنْ كُلِّ طَبَقَةٍ مِنْهُمْ غَرِيبًا فِي حَيِّهِ , غَرِيبًا فِي قَبِيلَتِهِ , مُسْتَخْفِيًا بِإِسْلَامِهِ , قَدْ جَفَاهُ الْأَهْلُ وَالْعَشِيرَةُ ,فَهُوَ بَيْنَهُمْ ذَلِيلٌ حَقِيرٌ , مُحْتَمِلٌ لِلْجَفَاءِ , صَابِرٌ عَلَى الْأَذَى , حَتَّى أَعَزَّ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ الْإِسْلَامَ , وَكَثُرَ أَنْصَارُهُ وَعَلَا أَهْلُ الْحَقِّ , وَانْقَمَعَ أَهْلُ الْبَاطِلِ , فَكَانَ الْإِسْلَامُ فِي ابْتِدَائِهِ غَرِيبًا بِهَذَا الْمَعْنَى , وَقَوْلُهُ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ» :وَسَيَعُودُ غَرِيبًا «مَعْنَاهُ

وَاللَّهُ أَعْلَمُ :أَنَّ الْأَهْوَاءَ الْمُضِلَّةُ تَكْثُرُ فَيَضِلُّ بِهَا كَثِيرٌ مِنَ النَّاسِ وَيَبْقَى أَهْلُ الْحَقِّ الَّذِينَ هُمْ عَلَى شَرِيعَةِ الْإِسْلَامِ غُرَبَاءَ فِي النَّاسِ لِقِلَّتِهِمْ , أَلَمْ تَسْمَعْ إِلَى قَوْلِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ :تَفْتَرِقُ أُمَّتِي عَلَى ثَلَاثٍ وَسَبْعِينَ فِرْقَةٍ , كُلُّهَا فِي النَّارِ إِلَّا وَاحِدَةٌ, فَقِيلَ :مَنْ هِيَ النَّاجِيَةُ؟ فَقَالَ :مَا أَنَا عَلَيْهِ وَأَصْحَابِي , وَبِقَوْلِهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : مُرُوا بِالْمَعْرُوفِ وَانْهَوْا عَنِ الْمُنْكَرِ حَتَّى إِذَا رَأَيْتَ شُحًّا مُطَاعًا وَهَوًى مُتَّبَعًا وَدُنْيَا مُؤْثَرَةً وَإِعْجَابَ كُلِّ ذِي رَأْيٍ بِرَأْيِهِ , وَرَأَيْتَ أَمْرًا لَا يَدَ لَكَ بِهِ فَعَلَيْكَ بِخَاصَّةِ نَفْسِكَ وَإِيَّاكَ وَعَوَامِّهِمْ , فَإِنَّ فِيهِمْ أَيَّامُ الصَّبْرِ الصَّبْرُ فِيهِنَّ كَقَبْضٍ عَلَى الْجَمْرِ , فَهَذِهِ صِفَةٌ مِنْ صِفَاتِ الْغَرِيبِ الصَّابِرِ عَلَى دِينِهِ حَتَّى يَسْلَمَ مِنَ الْأَهْوَاءِ.

٩. ئەگەر قسەکەرێک وتی:

واتای ئەم فەرموودەی رسول الله ﷺ چییە : ئیسلام بەنامۆیی دەستی پێکردووە وە نامۆیش دەبێتەوە وەک سەرەتا؟

بەو دەوترێ : خەڵکی پێش ئەوەی پێغەمبەر ﷺ بۆیان بنێردرێ خاوەنی چەند ئاینێکی جیاوازبوون : جولەکە و گاور و مەجووسی و بت پەرستەکان، کاتێک رسول الله ﷺ نێردرا هەریەکێک لەهەر چینێک کاتێ مسوڵمان دەبوو نامۆ بوو لە گەڕەکەکەی، نامۆ بوو لەناو هۆزەکەی، ئیسلامەتییەکەی دەشاردەوە، ئەهل و هۆز و عەشیرەتەکەی وشک بوون بەرامبەری، و ئەویش لەنێوانیاندا زەلیل و سووک بوو، بەرگەی وشکییەکەیانی دەگرت، ئارامگربوو لەسەر ئازارەکانیان، هەتا الله عَزَّ وَجلَّ ئیسلامی بەعیزەت کرد، و سەرخەرانی زیادیان کرد، و ئەهلی حەق ڕاستی بەرزبوونەوە، و ئەهلی باطلی زەلیل کرد، ئیسلام لەسەرەتا بەو مانایە

نامۆ بوو. واتای ئەو وتەیەی پێغەمبەر ﷺ ﴿دووبارە نامۆ دەبێتەوە﴾ والله اعلم واتا: بەڕاستی هەواو ئارەزووە گومڕاکەرەکان زۆردەبن و خەڵکێکی زۆر پێی گومڕادەبن، ئەهلی حەق دەمێنێتەوە ئەوانەی لەسەر شەریعەتی ئیسلام ن و نامۆن لەنێو خەڵکی بەهۆی کەمی ژمارەیان .

ئایا نەتبیستووە دەربارەی وتەی پێغەمبەر : ﷺ ﴿ئوممەتەکەم دابەشدەبن بەسەر حەفتاو سێ گرووپ، هەموویان لە ئاگردان ئیللا یەکێکیان نەبێت﴾ وترا کێیە ئەم کۆمەڵە ڕزگاربووە ؟ فەرمووی: ﴿ ئەوانەی لەسەر ئەو ڕێبازەن کە من و هاوەڵانم لەسەرین﴾ .

هەروەها ئەو وتەیەی پێغەمبەر : ﷺ ﴿فرمان بە چاکە بکەن و ڕێگری لەخراپە بکەن، هەتاوەکو کاتێ ئەبینن، چرووکیەکی گوێڕایەڵی بۆکراو وە هەوا ئارەزوویەکی شوێنکەوتە بۆ کراو وە دونیایەکی هەڵبژێردراو، وە هەر خاوەن ڕەئیەک سەرسامبوو بە ڕەئیی و بۆچوونی خۆی، وە یان کارێکت بینی دەسەڵاتت نییە بەسەریدا، لەوکاتەدا بەتایبەت خەریکی نەفسی خۆت بە، نەکەی لەگەڵ خەڵکە عەوامەکەیان بیت، چونکە ئەم ڕۆژانە ڕۆژی ئارامگرتنی تیایە، ئارامگرتن تیایاندا وەک دەستگرتنە بەپشکۆیەکی ئاگرین﴾.

ئەمە سیفەتێکە لە سیفاتی کەسێکی نامۆ و ئارامگر لەسەر دینەکەی هەتاوەکو سەلامەت بێت لە هەواو ئارەزووە گومڕاکەرەکان.

١٠ . الْمُضِلَّةِ , وَمِنْ صِفَةِ الْغُرَبَاءِ أَيْضًا الَّتِي نُعِتَ بِهَا أَهْلُ الْحَقِّ أَنْ يَكُونَ الْغَالِبُ عَلَى النَّاسِ فِي جَمِيعِ أُمُورِهِمْ مِثْلُ مُؤَاخَاةِ الْإِخْوَانِ , وَصُحْبَةُ الْأَصْحَابِ , وَمُجَاوَرَةُ الْجِيرَانِ , وَصِلَةُ الْأَرْحَامِ , وَعِيَادَةُ الْمَرْضَى وَشُهُودُ الْجَنَائِزِ , وَمَا يَجْرِي عَلَيْهِمْ مِنَ الْمَصَائِبِ , وَمَا يُسِرُّونَ بِهِ مِنَ الْأَفْرَاحِ بِالدُّنْيَا وَالْمُتَاجَرَةُ وَالْمُعَامَلَةُ وَالْمَحَبَّةُ وَالْبُضْعَةُ وَالْمُزَاوَرَةُ وَالْمُلَاقَاةُ وَالْمُجَالَسَةُ وَالِاجْتِمَاعُ فِي الْوَلَائِمِ وَأَشْبَاهٌ لِهَذِهِ الْأُمُورِ , فَإِنَّ جَمِيعَ ذَلِكَ يَجْرِي بَيْنَهُمْ عَلَى خِلَافِ الْكِتَابِ وَالسُّنَّةِ لِغَلَبَةِ الْجَهْلِ عَلَيْهِمْ وَلِدُرُوسِ الْعِلْمِ فِيهِمْ , فَإِذَا أَرَادَ الْمُؤْمِنُ الْعَاقِلُ الَّذِي قَدْ فَقَّهَهُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ فِي الدِّينِ وَبَصَّرَهُ عُيُوبَ نَفْسِهِ , وَقَبِيحَ مَا النَّاسُ عَلَيْهِ وَرَزَقَهُ مَعْرِفَةً بِالتَّمْيِيزِ بَيْنَ الْحَقِّ وَالْبَاطِلِ , وَبَيْنَ الْحَسَنِ وَالْقَبِيحِ وَبَيْنَ الضَّارِّ وَالنَّافِعِ , وَعَلِمَ مَا لَهُ مِمَّا عَلَيْهِ إِذْ أَلْزَمَ نَفْسَهُ الْعَمَلَ بِالْحَقِّ بَيْنَ ظَهْرَانَيْ مَنْ قَدْ جَهِلَ الْحَقَّ , بَلِ الْغَالِبُ عَلَيْهِمُ اتِّبَاعُ الْهَوَى , لَا يُبَالُونَ مَا نَقَصَ مِنْ دِينِهِمْ إِذَا سَلِمَتْ لَهُمْ دُنْيَاهُمْ , فَإِذَا نَظَرُوا إِلَى مَنْ يُخَالِفُهُمْ عَلَى طَرِيقَتِهِمْ ثَقُلَ ذَلِكَ عَلَيْهِمْ فَمَقَتُوهُ وَخَالَفُوهُ وَطَلَبُوا لَهُ الْعُيُوبَ فَأَهْلُهُ بِهِ مُتَضَجِّرُونَ وَإِخْوَانُهُ بِهِ مُتَثَقِّلُونَ وَمُعَامِلُوهُ بِهِ غَيْرُ رَاغِبِينَ فِي مُعَامَلَتِهِ , وَأَهْلُ الْأَهْوَاءِ لَهُ عَلَى مَذْهَبِ الْحَقِّ مُخَالِفُونَ , فَصَارَ غَرِيبًا فِي دِينِهِ لِفَسَادِ دِينِ أَكْثَرِ الْخَلْقِ غَرِيبًا فِي مُعَامَلَتِهِ لِكَثْرَةِ فَسَادِ مَعَاشِ أَكْثَرِ الْخَلْقِ , غَرِيبًا فِي مُؤَاخَاتِهِ وَصُحْبَتِهِ لِكَثْرَةِ فَسَادِ صُحْبَةِ النَّاسِ وَمُؤَاخَاتِهِمْ , غَرِيبًا فِي جَمِيعِ أُمُورِ الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ لَا يَجِدُ عَلَى ذَلِكَ مُسَاعِدًا يَفْرَحُ بِهِ وَلَا مُؤَانِسًا يَسْكُنُ إِلَيْهِ , فَمِثْلُ هَذَا غَرِيبٌ مُسْتَوْحِشٌ لِأَنَّهُ صَالِحٌ بَيْنَ فُسَّاقٍ , وَعَالِمٌ بَيْنَ جُهَّالٍ , وَحَلِيمٌ بَيْنَ سُفَهَاءَ , يُصْبِحُ حَزِينًا , وَيُمْسِي حَزِينًا , كَثِيرٌ غَمُّهُ قَلِيلٌ فَرَحُهُ , كَأَنَّهُ مَسْجُونٌ كَثِيرُ الْبُكَاءِ كَالْغَرِيبِ الَّذِي لَا يُعْرَفُ وَلَا يَأْنَسُ بِهِ

أَحَدٌ , يَسْتَوْحِشُ مِنْهُ مَنْ لَا يَعْرِفُهُ فَهَذَا مَعْنَى قَوْلِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : «وَسَيَعُودُ غَرِيبًا كَمَا بَدَأَ «وَاللَّهُ أَعْلَمُ.

١٠. هەروەها لە سیفاتی نامۆکان کە ئەهلی حەق سیفەتییانە بەڕاستی زۆرترن بەسەر خەڵکی لە گشت فەرمانەکانیان وەک برایەتی کردنی برایان وە هاوڕێیەتیکردنی هاوڕێیان وە دراوسێەتیکردنی دراوسێ وە گەیاندنی پەیوەندیی خزمایەتیی، بەسەرکردنەوەی نەخۆش وە ئامادەبوون لە ناشتنی مردوو، وە هەرشتێک لەنێوانیان ڕوودەدات لە موسیبەتەکان وە هەموو ئەوشتانەی دڵخۆشییان دەکات لە خۆشییەکانی دونیا،بازرگانی کردن و مامەڵەکردن و خۆشویستن و ڕق لێبوون و پێکگەیشتن و دانیشتن بەیەکەوە و کۆبوونەوە لەکاتی دەعوتت و بانگهێشتکردنەکان وە هاوشێوەی ئەم کارانە، تێکڕای ئەم کارانە ڕووئەدات لەنێویاندا بەپێچەوانەی قورئان و سوننەت بەهۆی زاڵبوونی نەزانی بەسەریانەوە، وە بەهۆی لێکهەڵوەشانی زانستی شەرعیی تیایاندا .

بۆیە کاتێ بڕواداڕێکی عاقڵ کە اللە عَزَّ وَجلَّ تێیگەیاندووە لە دین وە وایلێکردووە کەموکوڕییەکانی نەفسی خۆی ببینێ و چاو کراوەی کردووە لەوەی کە خەڵکی دەیکەن،وە زانیاریی پێبەخشیوە بەجیاکاریی لەنێوان حەق و باطل، لەنێوان جوان و ناشرین و لەنێوان سوودبەخش و زیانبەخش،وە زانستبوون بەوەی کە هەیەتی و بەوەی لەسەرییەتی بیکات، بۆیە کاتێک خۆی پابەندەکات بەوەی کاربکات بەحەق و ڕاستییەکان لەنێو ئەوکەسانەی کە نەزانن بە حەقەکە بەڵکو شوێنکەوتنی هەوا و ئارەزوو زاڵە بەسەریاندا،گوێنادەن بەوەی لەدینەکەیان کەم

كتاب السلف

بكات بۆ ئەوەی دونیاکەیان سەلامەت بێت، بۆیە کاتێک ئەبینن کەسێک پێچەوانەی ئەوان ئەکات لە ڕێبازەکەیان ئەوکات لەسەریان قورس ئەبێت بۆیە ڕقیان لێ ئەبێتەوە و پێچەوانەیان ئەکرد،وە بەدوای عەیبەکانی ئەگەڕان، ئەهل و کەسوکاری لێی بێزارن، و خوشک و براکانی بە بارگرانی ئەزانن، وە ئەو کەسانەی مامەڵەی لەگەڵ دەکەن حەزناکەن مامەڵەی لەگەڵ بکەن،وە ئەهلی هەوا و ئارەزووەکان لەسەر حەق پێچەوانەن بۆیە نامۆ ئەبێ لە دینەکەی بەهۆی خراپبوونی دینی زۆربەی خەڵکی، لە مامەڵەکردنەکانی نامۆیە بەهۆی تێکچوونی بژێوی ژیانی زۆربەی خەڵکی، نامۆیە لە برایەتی و هاوڕێیەتی بەهۆی خراپبوونی هاوڕێیەتیکردنی خەڵک و برایەتییان، نامۆ لە هەموو کاروبارەکانی دونیا و دوارۆژ، لەمەدا هیچ یارمەتیدەرێک نادۆزێتەوە دڵی پێخۆش بێت، نە هیچ دڵدەرەوەیەکیش لەلای هەست بە ئارامیی بکات، نمونەی ئەم نامۆیە زۆر هەست بەتەنیایی ئەکات لەبەرئەوەی کەسێکی چاکە لەنێو کۆمەڵێک کەسی زۆر فاسق و خراپ، وە زانایە لەنێو کۆمەڵی نەزان، نەرم و نیانە لەنێو هیچەکان، بەیانی ئەکاتەوە خەمبارە غەمی زۆرە، دڵخۆشی کەمە، وەک ئەوەی زیندانی بێت، گریانی زۆرە، وەک ئەو کەسە نامۆیەی کە ناناسرێت و هیچ کەسێک هۆگری نابێت، ئەو کەسەی نایناسێت لێی بێزار دەبێت، ئەمە واتای ئەو وتەیە پێغەمبەر ﷺ: ﴿دووبارە نامۆ ئەبێتەوە وەک چۆن سەرەتا دەستی پێکرد﴾ والله اعلم.

قال محمد بن الحسين :

١١.فَلَوْ تُشَاهِدُهُ فِي الْخَلَوَاتِ يَبْكِي بِحُرْقَةٍ , وَيَئِنُّ بِزَفْرَةٍ , وَدُمُوعُهُ تَسِيلُ بِعَبْرَةٍ , فَلَوْ رَأَيْتُهُ وَأَنْتَ لَا تَعْرِفُهُ لَظَنَنْتَ أَنَّهُ ثَكْلَى قَدْ أُصِيبَ بِمَحْبُوبِهِ , وَلَيْسَ كَمَا ظَنَنْتَ , وَإِنَّمَا هُوَ خَائِفٌ عَلَى دِينِهِ أَنْ يُصَابَ بِهِ , لَا يُبَالِي بِذَهَابِ دُنْيَاهُ إِذَا سَلِمَ لَهُ دِينُهُ , قَدْ جَعَلَ رَأْسَ مَالِهِ دِينَهُ يَخَافُ عَلَيْهِ الْخُسْرَانَ , كَمَا قَالَ الْحَسَنُ رَحِمَهُ اللَّهُ :رَأْسُ مَالِ الْمُؤْمِنِ دِينُهُ , حَيْثُ مَا زَالَ زَالَ مَعَهُ، لَا يُخَلِّفُهُ فِي الرِّحَالِ، وَلَا يَأْتَمِنُ عَلَيْهِ الرِّجَالَ.

قَلْتُ :وَلِلْغَرِيبِ أَوْصَافٌ كَثِيرَةٌ , قَدْ ذَكَرْتُ مِنْهَا مَا يُكْتَفَى بِهِ عَنِ الْكَثِيرِ مِنَ الْقَوْلِ.

محمد بن الحسين وتى:

١١ .ئەگەر لە کاتی خەڵوەت و تەنهاییدا ببینیت بە کووڵ ئەگریا، وناڵەی دێ بە ئازارەوە، وە فرمێسکەکانی دێنەخوارەوە بە نێوانیاندا، ئەگەر نەیناسیت وائەزانی دایکە لەمناڵەکەی جیابۆتەوە بەمناڵەکەی تاقیکراوەتەوە، بەڵام وەک ئەوە نییە کە گومانی پێدەبەیت، بەڵکو ئەترسێت لە دینەکەی تووشی تاقیکردنەوەبێت تێیدا، گوێنادات بە ڕۆیشتنی دونیاکەی ئەگەر دینەکەی پارێزراوبوو، دینەکەی کردووەتە سەرمایەکەی لە خەسارەتمەندیی لێی دەترسێت، وەک چۆن حسین رحمه الله دەڵێت : ﴿سەرمایەی ئیماندار دینەکەیەتی، هەرکاتێ نەما ئەویش نامێنێت، لەکاتی گەشتدا داینانێت لای کەسی تر، و لەهیچ کەسێکی لێی ئەمین نییە﴾.

وتم : بۆ نامۆیان وەسفی زۆر هەیە، ئەوەی کە باسمان کرد بۆیان بەس نییە لەو وتە زۆرانە.

١٢ .أَخْبَرَنَا مُحَمَّدٌ , قَالَ :أَنْشِدْنِي إِبْرَاهِيمُ بْنُ مُحَمَّدٍ لِبَعْضِ الْحُكَمَاءِ فِي مَعْنَى سَيْرِ الْغَرِيبِ إِلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ وَحْدَهُ:

الطُّرُقُ شَتَّى وَطَرِيقُ الْحَقِّ مُنْفَرِدٌ ... وَالسَّالِكُونَ طَرِيقَ الْحَقِّ أَفْرَادٌ

لَا يَطْلُبُونَ وَلَا تُطْلَبُ مَسَاعِيهِمْ ... فَهُمْ عَلَى مَهْلٍ يَمْشُونَ قُصَّادٌ

وَالنَّاسُ فِي غَفْلَةٍ عَمَّا لَهُ قَصَدُوا ... فَجُلُّهُمْ عَنْ طَرِيقِ الْحَقِّ رُقَادٌ

١٢ .محمد هەواڵی پێداین وتی : إبراهیم بن محمد سروودی بۆ وتم بۆ هەندێ لە داناکان دەربارەی ڕۆیشتنی نامۆ بەرەو لای اللە عَزَّ وَجلَّ بەتەنهایی :

ڕێگەکان جۆراوجۆرن و ڕێگەی حەق تاکە

ئەوانەی ڕێگەی حەقیشیان گرتۆتەبەر تاکن

داواناکەن و داواناکرێ هەوڵەکانیان

چونکە ئەوان بەهێواشیی ئەڕۆن و بەمەبەست

خەڵکیش بێئاگایە لەوەی ئەوان مەبەستیانە

چونکە زۆرینەیان دەربارەی ڕێگەی حەق لەخەوێکی قووڵدان

١٣. أَخْبَرَنَا مُحَمَّدٌ , قَالَ :وَأَنْشَدَنِي أَبُو عَلِيٍّ الْحَسَنُ بْنُ الْقَاسِمِ قَالَ :أَنْشَدَنِي أَبُو عَلِيٍّ الرَّقِّيُّ فِي بُكَاءِ الْغَرِيبِ عَلَى نَفْسِهِ" :

نَسَجْتُ مِنَ الْأَحْزَانِ شِعْرًا فَقُلْتُهُ ... لِأَنِّي غَرِيبٌ وَالْغَرِيبُ حَزِينُ
وَلَيْتَنِي دَهْرِي فَلَوْ كُنْتُ جَلْمَدًا ... لَلِنْتُ وَكُلٌّ لِلْبَلَاءِ يَلِينُ
فَلَا تَعْجَبُوا مِنْ أَنَّهُ بَعْدَ زَفْرَةٍ ... لِكُلِّ غَرِيبٍ فِي الظَّلَامِ أَنِينُ

١٣ .هەواڵی پێداین محمد سروودی بۆ وتم أبو علي الحسن بن القاسم وتی : أبو على الرقي دەربارەی گریانی نامۆ بۆ خۆی ئەم سروودەی بۆ وتم :

لەسەر خەم و پەژارە ئەم هۆنراوەم پێکهێنا و وتم
لەبەرئەوەی من نامۆم و نامۆش خەمبارە

ڕۆژگار لاواز و ناسکی کردوم ئەگەر چی تاشە بەردی زۆر گەورەش بم
چونکە گشت خەڵکی بەتاقیکردنەوە نەرم دەبن

بۆیە سەرسام مەبن بەناڵەیەک لەدوای نارەحەتی

## هەموو نامۆیەک لەتاریکیدا ناڵەی هەیە

١٤.قَالَ مُحَمَّدُ بْنُ الْحُسَيْنِ :رَأَيْتُ مُنْذَ سِنِينَ كَثِيرَةٍ مَعَ عَجُوزٍ جَوْرَبَيْنِ أَبْيَضَيْنِ , أَخْبَرَتْنِي أَنَّ شَابًّا مِنْ أَهْلِ دِمَشْقَ مَحْبُوسٌ فِي الْمُطْبَقِ مَظْلُومٌ , وَأَنَّهُ نَسَجَ عَلَى خَصْرَيْهِمَا بَيْتَيْنِ مِنَ الشِّعْرِ فِي الْغُرَبَاءِ عَلَى الْأَوَّلِ:

غَرِيبٌ يُقَاسِي الْهَمَّ فِي أَرْضِ غُرْبَةٍ ... فَيَا رَبِّ قَرِّبْ دَارَ كُلِّ غَرِيبٍ

وَعَلَى الثَّانِي:

وَأَنَا الْغَرِيبُ فَلَا أُلَامُ عَلَى الْبُكَا ... إِنَّ الْبُكَا حَسَنٌ بِكُلِّ غَرِيبٍ

١٤ .ساڵانێکی زۆر لەمەوپێش دوو گۆرەوی سپیم بینی  لای پیرێک، پێی ڕاگەیاندم کەوا گەنجێک زیندانی کراوە لەژێر زەویدا لە دیمەشق، ستەملێکراوە،وە ئەو گەنجە دوو دێڕە شیعری نوسیوە لەو پۆشاکەی قاچەکانی پێ دادەپۆشی دەربارەی نامۆکان :

لە یەکەمیان نوسرابوو :

نامۆیەک ململانێی خەم و پەژارە دەکات لەخاکی نامۆیی

دەسا ئەی پەروەردگار ماڵی هەر نامۆیەک نزیک بکەرەوە

وە لەسەر دووەمیان نوسرابوو:

چونکه من نامۆم لۆمه ناکرێم لەسەر گریانم
گریان جوانییە بۆ هەموو نامۆیەک

١٥ - .أَخْبَرَنَا مُحَمَّدٌ قَالَ :وَأَنْشَدَنِي أَبُو الْحُسَيْنِ مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ الرَّازِيُّ لِبَعْضِ الْحُكَمَاءِ:

إِنَّ الْغَرِيبَ لَهُ اسْتِكَانَةُ مُذْنِبٍ ... وَخُضُوعُ مَدْيُونٍ وَذُلُّ مُرِيبٍ
إِنَّ الْغَرِيبَ وَإِنْ أَقَامَ بِبَلْدَةٍ ... يُجْبِي اللَّهُ خَرَاجَهَا لِغَرِيبِ

١٥ .محمد هەواڵی پێداین وتی : أبو الحسن محمد بن جعفر الرازي سروودی بۆ وتم بۆ هەندێ لە داناکان :

نامۆ ملکەچی گوناهکاری هەیە
[واتە ملکەچیەکەی بۆ گوێڕایەڵی الله تعالی وەک گوناهکارێکە]
ملکەچبوونی قەرزار و زەلیلیی کەسی بەگومان

گەرچی نامۆ لە وڵاتی خۆشی نیشتەجێ بێت
کە ڕزق و خێری بۆ دێت هەر نامۆیە

## ﴿ بَابُ الْحَثِّ عَلَى بُلُوغِ مَرَاتِبِ الْغُرَبَاءِ ﴾

## | دەروازەی سووربوون لەسەر گەیشتن بە پلەی نامۆکان |

١٦ - أَخْبَرَنَا مُحَمَّدٌ قَالَ :حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرٍ جَعْفَرُ بْنُ مُحَمَّدٍ الْفِرْيَابِيُّ قَالَ :حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ عَفَّانَ الصُّوفِيُّ قَالَ :حَدَّثَنَا فُضَيْلُ بْنُ عِيَاضٍ , عَنْ لَيْثِ بْنِ أَبِي سُلَيْمٍ , عَنْ مُجَاهِدٍ , عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ :أَخَذَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِبَعْضِ جَسَدِي فَقَالَ لِي» :يَا ابْنَ عُمَرَ كُنْ فِي الدُّنْيَا كَأَنَّكَ غَرِيبٌ أَوْ عَابِرُ سَبِيلٍ , وَعُدَّ نَفْسَكَ مِنْ أَهْلِ الْقُبُورِ«

١٦ .ابن عمر ـ رضي الله عنهما ـ وتی : رسول الله ﷺ هەندێ لە جەستەمی گرت و پێی وتم : ﴿ئەی ابن عمر لە دونیادا وەک نامۆیەک بە، یان ڕێبواری ڕێیەک، وە خۆت حیساب بکە لەگەڵ ئەهلی گۆڕستان﴾ .

١٧ - أَخْبَرَنَا مُحَمَّدٌ قَالَ :وَحَدَّثَنَا الْفِرْيَابِيُّ قَالَ :حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْحَسَنِ الْبَلْخِيُّ قَالَ :أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ الْمُبَارَكِ قَالَ :أَخْبَرَنَا سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ , عَنْ لَيْثٍ , عَنْ مُجَاهِدٍ ,عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ أَخَذَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِبَعْضِ جَسَدِي فَقَالَ : »كُنْ فِي الدُّنْيَا كَأَنَّكَ غَرِيبٌ أَوْ عَابِرُ سَبِيلٍ , وَعُدَّ نَفْسَكَ مِنْ أَهْلِ الْقُبُورِ , «وَقَالَ لِي ابْنُ عُمَرَ :فَإِذَا أَصْبَحْتَ فَلَا تُحَدِّثْ نَفْسَكَ بِالْمَسَاءِ , وَإِذَا أَمْسَيْتَ فَلَا تُحَدِّثْ نَفْسَكَ بِالصَّبَاحِ , وَخُذْ مِنْ صِحَّتِكَ قَبْلَ سَقَمِكَ وَمِنْ حَيَاتِكَ قَبْلَ مَوْتِكَ , فَإِنَّكَ لَا تَدْرِي يَا عَبْدَ اللَّهِ مَا اسْمُكَ غَدًا."

١٧ .ابن عمر . رضي الله عنهما . وتى : رسول الله ﷺ هەندێ لە جەستەمی گرت و پێی وتم : ﴿ئەی ابن عمر لە دونیادا وەک نامۆیەک بە،یان ڕێبواری ڕێیەک، وە خۆت حیساب بکە لەگەڵ ئەهلی گۆڕستان﴾ .

وە ابن عمر . رضي الله عنهما . وتی : گەر بەیانیت کردەوە باسی ئێوارە لای خۆت مەکە، وە گەر ئێوارەت کردەوە باسی بەیانی لای خۆت مەکە [واتە ئەوەندە دڵنیا مەبە لەوەی کە ئێوارە دەکەیتەوە یان نا]، سوود لە تەندرووستیت وەرگرە پێش ئەوەی نەخۆش بکەویت، وە سوود لە ژیانت وەرگرە پێش ئەوەی بمریت، لەبەرئەوەی تۆ نازانی ئەی بەندەی الله کە بەیانی ناوت چییە [واتە ئایە پێت دەوترێ خۆشبەخت یان بەدبەخت].

١٨. أَخْبَرَنَا مُحَمَّدٌ قَالَ :حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرٍ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ الْحَمِيدِ الْوَاسِطِيُّ قَالَ حَدَّثنا ابْنُ أَبِي بَزَّةَ , مُؤَذِّنُ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ قَالَ :حَدَّثَنَا مَالِكُ بْنُ سُعَيْرٍ قَالَ :حَدَّثَنَا الْأَعْمَشُ , عَنْ مُجَاهِدٍ , عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ :- أَخَذَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِعَضَلَةِ سَاقِي أَوْ قال :بِبَعْضِ جَسَدِي وَقَالَ» :يَا عَبْدَ اللَّهِ كُنْ فِي الدُّنْيَا كَأَنَّكَ غَرِيبٌ وَعُدَّ نَفْسَكَ مِنْ أَهْلِ الْقُبُورِ «قَالَ مُجَاهِدٌ وَقَالَ لِي عَبْدُ اللَّهِ :يَا مُجَاهِدُ فَإِذَا أَمْسَيْتَ فَلَا تُحَدِّثْ نَفْسَكَ بِالصَّبَاحِ , وَإِذَا أَصْبَحْتَ فَلَا تُحَدِّثْ نَفْسَكَ بِالْمَسَاءِ , وَخُذْ مِنْ دُنْيَاكَ لِآخِرَتِكَ.

١٨ .ابن عمر. رضي الله عنهما . وتی : رسول الله ﷺ هەندێ لە جەستەمی گرت و پێی وتم : ﴿ئەی عبدالله لە دونیادا وەک نامۆیەک بە، وە خۆت حیساب بکە لە ئەهلی گۆڕستان﴾ .

مجاهد وتی : عبدالله پێی وتم : ئەی مجاهد گەر بەیانیت کردەوە باسی ئێوارە لای خۆت مەکە، وە گەر ئێوارەت کردەوە باسی بەیانی لای خۆت مەکە، سوود لە دونیا وەرگرە پێش ئەوەی ئاخیرەت بێ .

١٩ -أَخْبَرَنَا مُحَمَّدٌ قَالَ :حَدَّثَنَا أَبُو الْعَبَّاسِ أَحْمَدُ بْنُ مُوسَى بْنِ زَنْجَوَيْهِ الْقَطَّانُ قَالَ :حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ الْوَلِيدِ الطَّبَرَانِيُّ الْقُرَشِيُّ , قَالَ حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ , قَالَ حَدَّثَنَا الْأَوْزَاعِيُّ , عَنْ عَبْدَةَ بْنِ أَبِي لُبَابَةَ, عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ :أَخَذَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِبَعْضِ جَسَدِي فَقَالَ لِي» :اعْبُدِ اللَّهَ كَأَنَّكَ تَرَاهُ , وَكُنْ فِي الدُّنْيَا كَأَنَّكَ عَابِرُ سَبِيلٍ«

١٩ .ابن عمر. رضي الله عنهما . وتی : رسول الله ﷺ هەندێ لە جەستەمی گرت و پێی وتم : ﴿بەو شێوەیە الله بپەرستە وەک ئەوەی ببینیت، وە لە دونیادا وەک رێبواری رێیەک بە﴾ .

كتاب السلف

٢٠ - وَأَخْبَرَنَا مُحَمَّدٌ قَالَ :وَأَنْشَدَنِي أَبُو بَكْرٍ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ حُمَيْدٍ الْمُؤَدِّبُ:

أَيُّهَا الْغَافِلُ فِي ... ظِلِّ نَعِيمٍ وَسُرُورٍ
كُنْ غَرِيبًا وَاجْعَلِ الدُّ ... نْيَا سَبِيلًا لِلْعُبُورِ
وَاعْدُدِ النَّفْسَ طُوَالَ ... الدَّهْرِ مِنْ أَهْلِ الْقُبُورِ
وَارْفُضِ الدُّنْيَا وَلَا ... تَرْكَنْ إِلَى دَارِ الْغُرُورِ

٢٠ .محمد هەواڵی پێداین وتی : أبوبكر عبدالله بن حميد المؤدب سرروودی بۆ وتم و وتی :

ئەی بێئاگا لەژێر سێبەری نیعمەت و خۆشیی
نامۆ بە و دونیا بکە بە ڕێیەک بۆ تێپەڕین

و بەدرێژایی ڕۆژگار خۆت ئەژماربکە لە ئەهلی گۆڕستان
ودونیا ڕەتبکەوە و لامەدە بەلای غروری

٢١ - قَالَ مُحَمَّدُ بْنُ الْحُسَيْنِ رَحِمَهُ اللَّهُ :فَإِنْ قَالَ قَائِلٌ :أَيْشَ يَحْتَمِلُ قَوْلُ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ :كُنْ فِي الدُّنْيَا كَأَنَّكَ غَرِيبٌ أَوْ عَابِرُ سَبِيلٍ؟ , قِيلَ لَهُ :وَاللَّهُ أَعْلَمُ :هُوَ الرَّجُلُ الْحَاضِرُ الَّذِي قَدْ أَنْعَمَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ عَلَيْهِ , فَرَزَقَهُ مَالًا وَوَلَدًا سَرَّهُ بِهِمَا , وَزَوْجَةً حَسْنَاءَ وَدَارًا قَوْرَاءَ , وَلِبَاسًا نَاعِمًا , وَطَعَامًا طَيِّبًا , فَبَيْنَا هُوَ كَذَلِكَ إِذْ عَرَضَ لَهُ سَفَرٌ لَابُدَّ لَهُ مِنَ الْخُرُوجِ فِيهِ , فَخَرَجَ فَطَالَ بِهِ السَّفَرُ وَفَقَدَ جَمِيعَ مَا كَانَ يَلَذُّ بِهِ , وَصَارَ غَرِيبًا فِي بَلَدٍ لَا يُعْرَفُ فَاسْتَوْحَشَ مِنَ الْغُرْبَةِ لِمَا قَاسَى فِيهَا مِنَ الذُّلِّ وَالْمَسْكَنَةِ , وَحَنَّ قَلْبُهُ إِلَى الرُّجُوعِ إِلَى وَطَنِهِ , فَجَدَّ فِي السَّيْرِ , هَمُّهُ فِي مَسِيرِهِ أَنْ يَقْطَعَ السَّفَرَ بِالتَّحَرِّي , فَطَعَامُهُ الْيَسِيرُ مِمَّا فِيهِ كِفَايَتُهُ وَلِبَاسُهُ الْحَقِيرُ لِمَا يَسْتُرُ بِهِ عَوْرَتَهُ جُلُّ مَا يَحْمِلُ مَعَهُ جِرَابُهُ وَرِكْوَتُهُ , يُكَابِدُ السَّهَرَ لِيَقْطَعَ عَنْهُ شِدَّةَ آلَامِ السَّفَرِ , وَقَلْبُهُ مُتَطَلِّعٌ إِلَى مَا يَلَذُّ بِهِ الْحَضَرُ مُحْتَمِلٌ لِلْأَذَى صَابِرٌ عَلَى الْبَلْوَى لَا يَعْرُجُ فِي مَسِيرِهِ عَلَى شَيْءٍ مِنْ أُمُورِ الدُّنْيَا غَيْرَ مَا فِيهِ بَعْضُ كِفَايَتِهِ , قَدْ لَهَى عَنْ كُلِّ شَيْءٍ لَهُ فِيهِ لَذَّةٌ , يَنَامُ بِاللَّيْلِ فِي الْأَوْدِيَةِ وَالشِّعَابِ وَيَقِيلُ بِالنَّهَارِ فِي فَيَافِي الْجِبَالِ وَالشَّجَرِ عَلَى التُّرَابِ , إِذَا مَرَّ بِمَا تَهْوَاهُ النُّفُوسُ لَا يَعْرُجُ عَلَيْهِ , يُحَادِثُ نَفْسَهُ بِالصَّبْرِ عَنْهُ يَقُولُ لَهَا حَتَّى أَبْلُغَ مُسْتَقَرِّي فَأَمْنَحَكِ مَا تُحِبِّينَ , إِذَا أَجْهَدَهُ السَّيْرُ يَبْكِي بِحُرْقَةٍ وَيَئِنُّ بِزَفْرَةٍ وَيَخْتَنِقُ بِعَبْرَةٍ لَا يَجْفُو عَلَى مَنْ جَفَا عَلَيْهِ وَلَا يُؤَاخِذُ مَنْ آذَاهُ وَلَا يُبَالِي بِمَنْ جَهِلَهُ , قَدْ هَانَ عَلَيْهِ فِي غُرْبَتِهِ جَمِيعُ أُمُورِ الدُّنْيَا حَتَّى يَقْطَعَ السَّفَرَ وَيَرِدَ الْحَضَرَ , فَقِيلَ لِهَذَا الْمُؤْمِنِ الْعَاقِلِ الَّذِي يُرِيدُ الْآخِرَةَ وَيَشْنَأُ الدُّنْيَا :كُنْ فِي الدُّنْيَا مِثْلَ هَذَا الْغَرِيبِ لَا يَعْرُجُ إِلَّا عَلَى مَا قَلَّ وَكَفَى وَقَدْ تَرَكَ مَا كَثُرَ وَأَلْهَى فَإِنَّكَ إِذَا فَعَلْتَ ذَلِكَ كُنْتَ غَرِيبًا كَعَابِرِ سَبِيلٍ حَتَّى تَرِدَ الْآخِرَةَ وَأَنْتَ مُحَقِّرٌ مِنَ الدُّنْيَا حِينَئِذٍ تَحْمَدُ عَوَاقِبَ الصَّبْرِ فِي جَمِيعِ مَا نَالَكَ مِنَ الْمَشَقَّةِ فِي سَفَرِكَ وَاللَّهُ أَعْلَمُ.

٢١ .محمد بن الحسين .رحمه الله .وتی : ئەگەر قسەکەرێک وتی : وتەی رسول الله ﷺ : ﴿لە دونیادا وەک نامۆیەک بە یان ڕێبوارێک﴾ واتای چی لەخۆ دەگرێ؟

پێی دەووترێ : الله ـش زاناترە:

ئەو پیاوەیە کە الله عَزَّ وَجلَّ لەنیعمەتی خۆی بەهرەوەری کردووە و سامان و منداڵی پێبەخشیوە بەوانە دڵخۆشی کردووە، وە ئافرەتێکی جوان، وە ماڵێکی فراوان، وە پۆشاکێکی نەرم و خواردنێکی خۆش، لەکاتێکا ئەو حاڵی بەم جۆرەیە سەفەرێکی بۆ هاتۆتە پێش کە ئیللا ئەبێ بۆی دەربچێت، ئەمیش چووەدەر بۆ سەفەرەکە، و سەفەرەکەی ماوەیەکی زۆری خایەند و هەموو ئەوشتانەی لەدەستدا کە چێژی لێ دەبینی و بوو بە نامۆیەک لەوڵاتێکدا و ناناسرێت، لە نامۆیی هەستی بەتەنیایی کرد لەبەر ئەو زەلیلی و ژێردەستەییەی ململانێی لەگەڵ دەکرد، وە دڵی بەپەرۆش بوو بۆ گەڕانەوە بۆ وڵاتەکەی بۆیە لەهەوڵێکی چڕدا بوو لە ڕۆیشتنەکەیدا، غەمەکەی لە ڕێگەدا بڕینی سەفەرەکەیە بەوریاییەوە، خواردنە کەمەکەی تێیدا بەسیەتی، وە جلە بێ نرخەکەی بەسە بۆ داپۆشینی عەورەتی، زۆربەی جار جراب [کەلوپەلێکی چەرمە بۆ هەڵگرتنی خواردن [و رکوەکەی] لەچەرم دروستکراوە بۆ ئاو هەڵگرتن] لەگەڵ خۆیدا هەڵئەگرێت، شەونخونی بەرگەدەگرێ بۆ بڕینی ئازارەکانی سەفەر وە دڵی پارچەپارچەیە بۆ ئەوشتانەی خەڵکی چێژی لێئەبینن، بەرگەگری ئازارە، ئارامگرە لەسەر تاقیکردنەوە، لەسەفەرەکەیدا لاناکاتەوە بۆ کاروبارە دونیاییەکان جگە لەوانەی پێویستین، وازهێناوە لەهەمووشتێک کە چێژی تێدابێ، لەشەوا ئەخەوێ لە دۆڵ و سەر گیاکان وە لە ڕۆژدا ڕوودەکاتە زەوییە مردووەکانی شاخەکان و درەختەکان لەسەر خۆڵ، ئەگەر تێپەڕی بەلای ئەوشتانەی نەفس

ئارەزووی لێیە لارنابێتەوە بۆ لایان، قسە لەگەڵ نەفسی خۆی دەکات دەربارەی ئارامگرتن لەسەری، پێی دەڵێت : هەتا ئەگەم بە شوێنی مانەوەم ئەوکات ئەوشتانەت پێئەدەم کە حەزت پێیەتی، ئەگەر ڕێکردن زۆرماندووی کرد بە کوڵ ئەگریا، ناڵە ئەکات بەهەناسە قووڵەوە وە دەخنکێت بەفرمێسکەوە،وە وشکی نانوێنێت بەرامبەر کەسێک وشکی لەبەرامبەردا بنوێنێت، وە لێی ناگرێت کەسێک ئازاری بدات، وە گوێنادات بەوکەسەی ئەمی لەبیرکردووە، لە نامۆییەکەیدا هەموو کاروبارەکانی دونیا کەم نرخ بووە بەلایەوە هەتا سەفەرەکەی ئەبڕێت و ئەگاتەجێ،بۆیە بەم بڕوادارە عاقل ە ئەوترێ کە قیامەتی ئەوێت و ڕقی لە دونیایە: لەدونیادا وەک ئەم نامۆیە بە،کە لاناکاتەوە ئیللا بۆ ئەوشتانەی کەمن و بەسە بۆ ئەو،وە ئەوشتانەی تەرک کردووە کە زۆرن و پێی دڵخۆش بێ، چونکە کە تۆ ئەمەت کرد ئیتر وەک نامۆیەک و ڕێبوارێکت لێدێت هەتا ئەگەیتە ئاخیرەت و خۆتت شاردۆتەوە لەدونیا، ئەوکات سوپاسی سەرجەم سەرەنجامەکانی ئارامگرتنت ئەکەی لەهەموو ئەو ناڕەحەتییانەی تووشت بوون لەکاتی سەفەرەکەتدا، اللّٰه ش زاناترە.

٢٢ - أَخْبَرَنَا مُحَمَّدٌ قَالَ :أَنْشَدَنِي أَبُو بَكْرٍ مُحَمَّدُ بْنُ الْجَهْمِ الْمَالِكِيُّ لِبَعْضِ الْحُكَمَاءِ:

فَتًى كَاسٍ فَلَمْ يَأْنَسْ ... عَلَى مَا يَعْطَبُ النَّاسُ
وَلَكِنْ جَدَّ فِي السَّيْرِ ... فَمَا قَصَرَ مَدَ كَاسٍ

كتاب السلف

وَقَوْمٌ جَمَعُوا الدُّنْيَا ... فَصَارَ الْقَوْمُ حُرَّاسًا

فَلَمْ يَشْغَلْ بِهِمْ قَلْبًا ... وَلَمْ يَرْفَعْ بِهِمْ رَأْسًا

فَتًى أَلْبَسَهُ اللَّهُ ... الْغِنَى وَالْعِزَّ وَالْيَأْسَ

فَلَمْ يَفْتَحْ حَانُوتًا ... وَلَمْ يَخْتِمِ الْأَكْيَاسَ

وَلَمْ يَأْلَفْ مَخْلُوقًا ... وَلَمْ يَطْلُبْ جُلَّاسًا

وَلَكِنْ جَعَلَ الذِّكْرَ ... مَعَ الْقُرْآنِ أُنَاسٌ

لَهُ دَمْعٌ يُنْبِئُكَ ... عَنِ الْقَلْبِ وَمَا قَاسَ

وَيَشْجِيكَ إِذَا مَا يُتْبِـ ... ـعُ الْأَنْفَاسَ أَنْفَاسًا

تَرَاهُ فِي الصَّحَارِي لِـ ... جَلَالِ اللَّهِ لَمَّاسًا

وَلَوْ قِيلَ لَهُ فِي قَوْ ... مٍ مَهْ وَاسَى بِهِ وَاسٍ

غَدًا يَخْرُجُ مِنْ أَبْـ ... يَضِ خَلْقِ اللَّهِ قِرْطَاسٌ

إِذَا مَا قِيلَ لِلْأَبْرَارِ ... قُومُوا فَاشْرَبُوا الْكَأْسَ

مَضَى يَخْتَرِقُ الْوَرْدَ ... إِلَى الْأَتْرَابِ وَالْآسِ

فَقَدْ صَارَتْ مَوَاثِيمُ ... مُحِبِّ اللَّهِ أَعْرَاسًا"

٢٢ .محمد هەواڵی پێداین وتی : أبو بكر محمد بن الجهم المالكي سوودی بۆ وتم بۆ هەندی لە داناكان :

لاوێک عاقل بوو غەمبار نەبوو

بەوشتانەی خەڵکی بەهیلاک برد

بەڵام لەڕێکردنا جددی بوو
کەمتەرخەمیی نەکرد لەوکاتەوەی عاقل بوو

وە قەومانێک دونیایان کۆکردەوە
وە ئەو قەومە بوون بە پاسەوان

ئەو لاوە نەدڵی سەرقاڵ کرد پێیانەوە
نەسەری بەرزکردەوە لێیان

لاوێک الله دەوڵەمەندی پێبەخشیی
لەگەڵ عیززەت و هێز

نە دوکانێکی پێ کردەوە
نە هیچ کیسەیەکیشی پێ گرت

نە هۆگری هیچ درووستکراوێ بووە
نە داوای کەسێکی کردووە لەگەڵیدا دابنیشێت

بەڵام یادی پەروەردگار و قورئانی
کردووە بە جێی هۆگر بوون

كتاب السلف

فرمێسكێكی هەیە هەواڵت پێدەدات

دەربارەی دڵ و ئەوەی ڕووبەڕووی بۆتەوە

غەمبار و دڵتەنگت ئەكات كاتێ

هەناسە بەدوای هەناسەدا دێنێت

دەیبینیت لە بیابانەكاندا

گەورەیی قەدری الله ئەیبات بۆخۆی

ئەگەریش لەكاتی بەهێزییا پێی بڵێیت

سەرەخۆشیی بكە ئەیكات

سبەی دێتەدەر لە دروستكراوێكی سپی پەروەردگاری وەک پەڕ

كاتێ بە چاكەكاران دەوترێ

هەڵسن بخۆنەوە لە پەرداخ و كاسەدا

ئەوكات ئەمیش ئەڕوات ئەگات

بە حەوزەكە و درەختە بۆن خۆشەكان

ئێستاكە خۆشەویستی پەروەردگاری

## كۆئەبێتەوە لەگەڵ بووکەکاندا

٢٣ .قَالَ مُحَمَّدُ بْنُ الْحُسَيْنِ رَحِمَهُ اللَّهُ :مَنْ أَحَبَّ أَنْ يَبْلُغَ مَرَاتِبَ الْغُرَبَاءِ فَلْيَصْبِرْ عَلَى جَفَاءِ أَبَوَيْهِ وَزَوْجَتِهِ وَإِخْوَانِهِ وَقَرَابَتِهِ.

٢٣ .محمد بن الحسين ـ رحمه الله ـ وتی: هەرکەسێ حەزدەکات بگات با پلەی نامۆکان، ئەوا با ئارام بگرێت لەسەر وشکیی دایک و باوکی،و هاوسەری، خوشک و براکانی و خزمەکانی.

٢٤ .فَإِنْ قَالَ قَائِلٌ :فَلِمَ يَجْفُونِي وَأَنَا لَهُمْ حَبِيبٌ وَغَمَّهُمْ لِفَقْدِي إِيَّاهُمْ إِيَّايَ شَدِيدٌ , قِيلَ :لِأَنَّكَ خَالَفْتَهُمْ عَلَى مَا هُمْ عَلَيْهِ مِنْ حُبِّهِمُ الدُّنْيَا وَشِدَّةِ حِرْصِهِمْ عَلَيْهَا , وَلِتَمَكُّنِ الشَّهَوَاتِ مِنْ قُلُوبِهِمْ , مَا يُبَالُونَ مَا نَقَصَ مِنْ دِينِكِ وَدِينِهِمْ إِذَا سَلِمَتْ لَهُمْ بِكَ دُنْيَاهُمْ , فَإِنْ تَابَعْتَهُمْ عَلَى ذَلِكَ كُنْتَ الْحَبِيبَ الْقَرِيبَ , وَإِنْ خَالَفْتَهُمْ وَسَلَكْتَ طَرِيقَ أَهْلِ الْآخِرَةِ بِاسْتِعْمَالِكَ الْحَقَّ جَفَا عَلَيْهِمْ أَمْرُكَ , فَالْأَبَوَانِ مُتَبَرِّمَانِ بِفِعَالِكَ , وَالزَّوْجَةُ بِكَ مُتَضَجِّرَةٌ فَهِيَ تُحِبُّ فِرَاقَكَ وَالْأَخَوَانِ وَالْقَرَابَةُ فَقَدْ زَهِدُوا فِي لِقَائِكَ , فَأَنْتَ بَيْنَهُمْ مَكْرُوبٌ مَحْزُونٌ , فَحِينَئِذٍ نَظَرْتَ إِلَى نَفْسِكَ بِعَيْنِ الْغُرْبَةِ , فَآنَسْتَ مَا شَاكَلَكَ مِنَ الْغُرَبَاءِ وَاسْتَوْحَشْتَ مِنَ الْإِخْوَانِ وَالْأَقْرِبَاءِ فَسَلَكْتَ الطَّرِيقَ إِلَى اللَّهِ الْكَرِيمِ وَحْدَكَ فَإِنْ صَبَرْتَ عَلَى خُشُونَةِ الطَّرِيقِ أَيَّامًا يَسِيرَةً وَاحْتَمَلْتَ الذُّلَّ وَالْمُدَارَاةَ مُدَّةً قَصِيرَةً وَزَهِدْتَ فِي هَذِهِ الدَّارِ الْحَقِيرَةِ أَعْقَبَكَ الصَّبْرُ أَنْ وَرَدَ بِكَ إِلَى دَارِ الْعَافِيَةِ , أَرْضُهَا طَيِّبَةٌ وَرِيَاضُهَا خَضِرَةٌ وَأَشْجَارُهَا مُثْمِرَةٌ وَأَنْهَارُهَا عَذْبَةٌ , فِيهَا مَا

تَشْتَهِي الْأَنْفسُ وَتَلَذُّ الْأَعْيُنُ , وَأَهْلُهَا فِيهَا مُخَلَّدُونَ} , يُسْقَوْنَ مِنْ رَحِيقٍ مَخْتُومٍ . خِتَامُهُ مِسْكٌ .وَفِي ذَلِكَ فَلْيَتَنَافَسِ الْمُتَنَافِسُونَ .وَمِزَاجُهُ مِنْ تَسْنِيمٍ .عَيْنًا يَشْرَبُ بِهَا الْمُقَرَّبُونَ] {المطففين} , :وَكَأْسٍ مِنْ مَعِينٍ لَا يُصَدَّعُونَ عَنْهَا وَلَا يُنْزِفُونَ وَفَاكِهَةٍ مِمَّا يَتَخَيَّرُونَ وَلَحْمِ طَيْرٍ مِمَّا يَشْتَهُونَ وَحُورٌ عِينٌ كَأَمْثَالِ اللُّؤْلُؤِ الْمَكْنُونِ جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ] {الواقعة}

٢٤ .ئەگەر قسەكەرێ وتی : بۆچی ئەوان وشكن بەرامبەرم لەكاتێكدا من ئەوانم خۆشدەوێت وە خەمم زۆرگەورەیە بۆ لەدەستدانی ئەوان؟ !

وترا: چونكە تۆ پێچەوانەی ئەوانت كرد لەوشتانەی ئەوان لەسەری بوو لە خۆشویستنی دونیا وە زۆر سووربوونیان لەسەری، وە زاڵبوونی شەهەوات بەسەر دڵیاندا گوێنادەن لەوەی لەدەست ئەچێ لەدینی تۆ یان هی خۆیان ئەگەر دونیاكەیان بەتۆ پارێزراوبێت، ئەگەر بەردوام بوویت لەگەڵیان لەسەرئەوە ئەوا تۆ دەبیتە خۆشەویست و نزیكیان [واتە وەک ئەوان ڕوو لەدونیابکەیت و شەهەوات بەسەر دڵتدا زاڵ بێت و دینت لەدەست بچێت]، وە ئەگەر پێچەوانەی ئەوانت كرد و ڕێگەی ئاخیرەتت گرتەبەر بە بەكارهێنانی حەق و ڕاستییەكەت ئەوكات تۆ وشک ئەبیت لایان.

دایک و باوک بێزاردەبن بە كارەكانت، و خێزانەكشت دڵتەنگە پێت و ئەو حەزدەكات لێت جیابێتەوە، خوشک و برایان و خزمەكانیشت كەمگربوونە لە دیدارت، چونكە تۆ لەنێو ئەواندا تووشی نەهامەتی بوویت و غەمباریت، بۆیە

لەوکاتەدا سەیری خۆت ئەکەی بەچاوی نامۆبوونەوە هۆگری ئەوانە دەبیت کە وەک خۆت نامۆن، و لەلای خوشک و برا و کەسە نزیکەکانی هەست بە تەنیایی دەکات، بۆیە بەتەنها ڕێگە دەگریتەبەر بەرەوە اللە ی کریم .

ئەگەر ئارام بگری لەسەر زبری ڕێگاکە چەند ڕۆژێکی کەم، وە بەرگەی زەلیلی و مداراة بگریّ بۆ ماوەیەکی کورت، وە بەکەمگر بوویت لەم ماڵە بێنرخە، ئارمگرتن سەرەنجامت دەگەیەنێت بە ماڵی سەلامەتی زەوییەکەی بۆنخۆشە، وە باخەکانی سەوزە، درەختەکانی بەروبوومدارە، ڕووبارەکانی سازگارن،ئەوشتانەی تیایە کە نەفس حەزی پێدەکات، وە چاوەکان چێژی لێدەبینن، ئەهلەکەی تێیدا نەمرن، ﴿ يُسْقَوْنَ مِن رَّحِيقٍ مَّخْتُومٍ (٢٥) خِتَٰمُهُۥ مِسْكٌۚ وَفِي ذَٰلِكَ فَلْيَتَنَافَسِ ٱلْمُتَنَٰفِسُونَ (٢٦) وَمِزَاجُهُۥ مِن تَسْنِيمٍ (٢٧) عَيْنًا يَشْرَبُ بِهَا ٱلْمُقَرَّبُونَ (٢٨) ﴾ [سورة المطففين]

[يُسْقَوْنَ مِن رَّحِيقٍ مَّخْتُومٍ (٢٥) ]

واتە : لە شەرابێکی پاک و صاف و سەر مۆریان پێدەنۆشێ، واتە :دەستی هیچ کەسێکی لێ نەکەوتووەو چاکان خۆیان سەرەکەی لا دەبەن .

دوا قومی بۆنی میسکی لێ دێت، واتە :وەک شەرابی دونیا نیە تا بۆگەنیی و سەر ئێشەو دەردو داوێکی زۆری هەبێت، جا ئەوانەی کە پێشبڕکێ و پێشدەستی دەکەن، با لەوەدا پێش دەستیی و کێبەرکێ بکەن و هەوڵبدەن بۆ کاروکردەوەی چاک.

هەروەها ئەو شەرابە پاكە لەگەڵ ئاوی كانیاوێكی بەرزو پاك و خۆشدا تێكەڵكراوە، واتە :شەرابی بەهەشت لە ئاوی (تەسنیم) ی تێكەڵ دەكرێ، ئەوجا دەیاندرێتێ بیخۆنەوە،سەرچاوەیەكە نزیكانی خوا لێی دەخۆنەوە، كەوابوو پلەی (مقربون) بەرزترە لە پلەی (أبرار)

﴿ يَطُوفُ عَلَيۡهِمۡ وِلۡدَٰنٞ مُّخَلَّدُونَ (١٧) بِأَكۡوَابٖ وَأَبَارِيقَ وَكَأۡسٖ مِّن مَّعِينٖ (١٨) لَّا يُصَدَّعُونَ عَنۡهَا وَلَا يُنزِفُونَ (١٩) وَفَٰكِهَةٖ مِّمَّا يَتَخَيَّرُونَ (٢٠) وَلَحۡمِ طَيۡرٖ مِّمَّا يَشۡتَهُونَ (٢١) وَحُورٌ عِينٞ (٢٢) كَأَمۡثَٰلِ ٱللُّؤۡلُوِٕ ٱلۡمَكۡنُونِ (٢٣) جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ (٢٤) ﴾
[سورة الواقعة]

واتە : كۆمەڵە منالێكی ئێسك سووك و هەمیشە لاو خزمەتیان دەكەن و دەگەڕێن بەسەریاندا،وە بە گۆزە و سوراحیی و پێكی پڕ لە شەرابی چۆمە ڕەوانەكانی بەهەشتەوە، سەریان پێی ئێش ناكا، و هۆشیشیان نابرێ بەوەی سەرخۆش ببن، واتە :وەك شەرابی ئەم دونیایە توشی قسەی پەتەڕییان ناكەن، وە دەگەڕێن بە جۆرەها میوەو لە هەر جۆرێ هەڵ دەبژێرن، وە دەگەڕێن بە گۆشتی پەلەوەرەوە، لە هەر جۆرێكی حەزی لێ بكەن، و ئافرەتانی چاو بەڵەك و چاو گەورەو سپی پێست و دەم و چاو درەخشانیان بۆ هەیە، لە پاك و خاوێنیی و جوانیی و ساف و بێ گەردیی و دەست لێنەكەوتوییدا، دەڵێیت مرواریی نێو سەدەفن، ئەو نیعمەتانە لە پاداشی كاروكردەوەی چاكیاندایە.

كتاب السلف

٢٥.أَخْبَرَنَا مُحَمَّدٌ قَالَ :ثَنَا أَبُو بَكْرٍ مُحَمَّدُ بْنُ أَحْمَدَ بْنِ هَارُونَ الْعَسْكَرِيُّ قَالَ :أَنْبَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ الْجُنَيْدِ الْخُتَّلِيُّ قَالَ حَدَّثَنِي أَبُو عَبْدِ اللَّهِ مُحَمَّدُ بْنُ الْعَبَّاسِ قَالَ :حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ مُعَاوِيَةَ الصُّوفِيُّ قَالَ ثَنَا رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ خُرَاسَانَ قَالَ " :أَوْحَى اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ إِلَى نَبِيٍّ مِنَ الْأَنْبِيَاءِ :إِنْ أَرَدْتَ لِقَائِي غَدًا فِي حَظِيرَةِ الْقُدُسِ فَكُنْ فِي الدُّنْيَا غَرِيبًا , مَحْزُونًا مُسْتَوْحِشًا كَالطَّيْرِ الْوَحْدَانِيِّ الَّذِي يَطِيرُ فِي الْأَرَاضِي الْقِفَارِ , وَيَأْكُلُ مِنْ رُءُوسِ الْأَشْجَارِ فَإِذَا كَانَ اللَّيْلُ أَوَى إِلَى وَكْرِهِ وَلَمْ يَكُنْ مَعَ الطَّيْرِ اسْتِئْنَاسًا بِرَبِّهِ وَاسْتِيحَاشًا مِنَ النَّاسِ."

٢٥ .محمد بن معاوية الصوفي وتی : پیاوێک لە ئەهلی خوراسان هەواڵی پێدام وتی: اللَّه عَزَّ وَجلَّ وەحی ناردووە بۆ پەیامبەرێک لە پەیامبەرەکانی، ئەگەر دەتەوێت سبەی بمبینیت لە حظيرة القدس [مەبەست پێی بەهەشتە والله اعلم]، ئەوا لە دونیادا نامۆبە، خەمبار و بەتەنها و لەخەڵوەتدا بە، وەک ئەو باڵندە تەنیایەی دەفڕێت لە زەوییە وشکەکاندا، وە لە سەری دارەکان دەخوات، کاتێ شەو داهات پەنادەباتەوە بۆ هێلانەکەی هیچ باڵندەیەکی لەگەڵدا نییە و هۆگری پەروەردگاری بووە، وە هەست بەتەنیایی دووری دەکات لە خەڵکی.

[مەبەستی ئەوەیە کە هیچ کەسێ نیە هاوڕێیەتی و هاوخەمی بکات یان یارمەتی بدات لەکارەکانی یان لەکاتی نارەحەتی دڵنەوایی بکات والله اعلم]

## ﴿ بَابُ صِفَةِ الْغَرِيبِ الَّذِي لَوْ أَقْسَمَ عَلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ لَأَبَرَّ قَسَمَهُ ﴾

## [دەروازەیەک دەربارەی سیفەتی ئەو نامۆیەی ئەگەر سوێند بخوات لەسەر اللَّه عَزَّ وَجلَّ قبووڵی دەکات]

٢٦ .أَخْبَرَنَا مُحَمَّدٌ قَالَ :ثَنَا أَبُو الْعَبَّاسِ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ الصَّقْرِ السُّكَّرِيُّ قَالَ :ثنَا يَعْقُوبُ بْنُ حُمَيْدِ بْنِ كَاسِبٍ قَالَ :حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ بْنِ سَعِيدٍ قَالَ :ثَنَا صَفْوَانُ بْنُ سُلَيْمٍ , عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ دِينَارٍ , عَنْ أَبِي صَالِحٍ السَّمَّانِ , عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ , أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ» :طُوبَى لِعَبْدٍ مُغْبَرَّةٌ قَدَمَاهُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ شَاعِثٌ رَأْسُهُ , إِنْ كَانَتِ السَّاقَةُ كَانَ فِيهِمْ وَإِنْ كَانَ الْحَرَسُ كَانَ فِيهِمْ إِنْ شَفَعَ لَمْ يَشَفَّعْ , وَإِنِ اسْتَأْذَنَ لَمْ يُؤَذَنْ لَهُ , طُوبَى لَهُ ثُمَّ طُوبَى لَهُ.«

٢٦ .پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ﴿خۆشبەختی بۆ بەندەیەک پێیەکانی خۆڵاویی ببن لەپێناو اللَّهعزوجل، قژی ئاڵۆز و تێکئاڵاوە، ئەگەر سەربازێک هەبێ لەپاشکۆی جەنگ ئەوە لەوان دەبێ، وە ئەگەر پاسەوانی هەبێ لەوان دەبێ، ئەگەر تکا بکرێ ئەوا ئەو تکای بۆ ناکرێ لەنێو خەڵکی، ئەگەر داوای ئیزن بکات ئیزنی نادرێ، خۆشبەختی بۆ ئەو،خۆشبەختی بۆ ئەو﴾.

[واتە ئەوکەسە کاتێ تووشی کێشەیەک دەبێ ئەبێ کەسێک هەبێ تکای بۆ بکات لای ئەوکەسانەی لەگەڵیان تووشی کێشەبووە تاوەکو لەسەری سووک بکەن، بۆیە ئەو کەسی نیە ئەو کارەبکات، وە ئیزنیش بۆ ڕووخسەت وەرگرتن لەهەندێ کاروباری ئاسایی ڕۆژانە یان شتێک باو بێت، بەڵام ئەو

چونكە بە كەم سەیردەكرێ بۆیە ڕەنگە هەندێ كات زوڵمی لێبكرێ یاخود وەك كەسێكی ئاسایی سەیرنەكرێ و مامەڵەی لەگەڵدا نەكەن والله اعلم].

٢٧.أَخْبَرَنَا مُحَمَّدٌ قَالَ :ثَنَا أَبُو سَعِيدٍ الْحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ الْجَصَّاصُ قَالَ :ثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَزِيزٍ الْأَيْلِيُّ قَالَ :حَدَّثَنِي سَلَامَةُ بْنُ رَوْحٍ , عَنْ عَقِيلِ بْنِ خَالِدٍ , عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ : حَدَّثَنِي أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ قَالَ :قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ» :رُبَّ أَغْبَرَ ذِي طِمْرَيْنِ لَا يُؤْبَهُ لَهُ لَوْ أَقْسَمَ عَلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ لَأَبَرَّهُ.

٢٧ .رسول الله ﷺ فەرموویەتی : ڕەنگە كەسێكی تەپ و تۆزاوی، خاوەن جلێكی دڕاو و بێ نرخ و هیچ گرنگی پێنادرێ لەلای خەڵكی، ئەگەر سوێند بخوات لەسەر اللَّه عَزَّ وَجلَّ ئەوا سوێندەكەی وەردەگرێ.

٢٨.أَخْبَرَنَا مُحَمَّدٌ بْنُ الَحُسَيْنِ قَالَ :حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ أَبِي دَاوُدَ قَالَ :حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ خَالِدٍ قَالَ :حَدَّثَنَا سُوَيْدُ بْنُ عَبْدِ الْعَزِيزِ قَالَ :حَدَّثَنَا زَيْدُ بْنُ وَاقِدٍ , عَنْ بُسْرِ بْنِ عُبَيْدِ اللَّهِ , عَنْ أَبِي إِدْرِيسَ الْخَوْلَانِيِّ , عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ , عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ» :أَلَا أُخْبِرُكُمْ عَنْ مُلُوكِ أَهْلِ الْجَنَّةِ؟ «قَالُوا :بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ» :كُلُّ ضَعِيفٍ أَغْبَرَ ذِي طِمْرَيْنِ لَا يُؤْبَهُ لَهُ لَوْ أَقْسَمَ عَلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ لَأَبَرَّهُ.«

٢٨ .پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ئایا هەواڵتان پێبدەم دەربارەی پادشاكانی ئەهلی بەهەشت؟

وتیان بەڵێ ئەی رسول الله.

فەرمووی : ﴿هەموو کەسێکی لاواز، تەپوتۆزاویی، خاوەنی جلوبەرگێکی پیس و دڕاو و بێ نرخ و هیچ گرنگییەکی پێنادرێ لای خەڵکی، ئەگەر سوێند بخوات لەسەر الله عَزَّ وَجلَّ ئەوا سوێندەکەی وەردەگرێ﴾.

٢٩.أَخْبَرَنَا مُحَمَّدٌ قَالَ :وَثَنَا أَبُو الْقَاسِمِ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ الْعَطَشِيُّ قَالَ :ثنَا أَبُو حَفْصٍ عُمَرُ بْنُ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ الْحَكَمِ النَّسَائِيُّ قَالَ :ثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْحُسَيْنِ الْبُرْجُلَانِيُّ قَالَ :حَدَّثَنِي الْحُسَيْنُ بْنُ أَحْمَدَ الشَّامِيُّ قَالَ :سَمِعْتُ ذَا النُّونِ الْمِصْرِيَّ , يَقُولُ " :رَكِبْنَا الْبَحْرَ نُرِيدُ مَكَّةَ , وَمَعَنَا فِي الْمَرْكَبِ رَجُلٌ عَلَيْهِ أَطْمَارٌ رَثَّةٌ , فَوَقَعَ فِي الْمَرْكَبِ تُهْمَةٌ فَدَارَتْ حَتَّى صَارَتْ إِلَيْهِ فَقُلْتُ :إِنَّ الْقَوْمَ قَدِ اتَّهَمُوكَ , فَقَالَ :إِيَّايَ تَعْنِي؟ فَقُلْتُ :نَعَمْ قَالَ :فَنَظَرَ إِلَى السَّمَاءِ وَقَالَ :أَقْسَمْتُ عَلَيْكَ ثُمَّ قَالَ :أَقْسَمْتُ عَلَيْكَ إِلَّا أَخْرَجْتَ مَا فِيهِ مِنْ حُوتٍ بِجَوْهَرَةٍ قَالَ :فَلَقَدْ خُيِّلَ إِلَيَّ أَنَّ مَا فِي الْبَحْرِ حُوتٌ إِلَّا وَقَدْ خَرَجَتْ فِي فِيهَا لُؤْلُؤَةٌ أَوْ جَوْهَرَةٌ , ثُمَّ رَمَى بِنَفْسِهِ فِي الْبَحْرِ وَذَهَبَ"

٢٩ .الحسين بن أحمد الشامي وتی : گوێم لێبوو لە ذا النون ی میسڕی بوو دەیوت :سواری کەشتی بووین ویستمان بەرەو مەککە بڕۆین، وە لەسەر کەشتییەکە پیاوێکمان لەگەڵ بوو جلوبەرگێکی دڕاو و بێنرخی لەبەردابوو، لەناو کەشتییەکەدا تۆمەتێک بڵاوبۆوە، سوڕایەوە هەتا گەیشت بەم پیاوە، پێم وت : ئەو کۆمەڵە خەڵکە تۆیان تۆمەتبارکرد ؟

وتی : مەبەستت منە؟

وتم : بەڵێ

وتی : سەیرێکی ئاسمانی کرد و وتی : سوێندم پێت خوارد.

پاشان وتی : سوێندم پێت خوارد کە هیچ ماسیەک دەرنەکەیت لەو دەریایە ئیللا لەناو دەمی مرواری یان گەوهەرێکی تیابێ.

وتی : وا هاتە خەیاڵم لەناو هەرچی ماسییەکی ناو دەریاکە هەبوو ئیللا مرواریيەک یان گەوهەرێکی لێ دەهاتە دەرەوە، پاشان پیاوەکە خۆی فڕێدایە ناو دەریاکە و ڕۆیشت .

٣٠ .أَخْبَرَنَا مُحَمَّدٌ قَالَ :أَنْشَدَنِي أَبُو بَكْرٍ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ حُمَيْدٍ الْمُؤَدِّبُ فِي ذَلِكَ" :

رُبَّ ذِي طِمْرَيْنِ نِضْوٍ ... يَأْمَنُ الْعَالِمُ شَرَّهُ

لَا يُرَى إِلَّا غَنِيًّا ... وَهُوَ لَا يَمْلِكُ ذَرَّةً

ثُمَّ لَوْ أَقْسَمَ فِي شَيْءٍ ... عَلَى اللَّهِ أَبَرَّهُ

٣٠ .محمد هەواڵی پێداین وتی : أبوبکر عبداللّٰه بن حمید المؤدب لەمەدا سروودێکی بۆ وتم :

ڕەنگە خاوەن جلێکی کۆن و دڕاو و بێسوود

کە خەڵکی پارێزراون لە خراپەی

نابينرێ ئيللا به دەوڵەمەندی نەبێ

لەکاتێکدا ئەو خاوەنی دەنکۆڵە گەردیلەیەکیش نییە

پاشان ئەگەر سوێند بخوات لەسەر

اللّه عَزَّ وَجلَّ بۆ شتێ،سوێندەکەی قبوڵ دەکات

٣١.أَخْبَرَنَا مُحَمَّدٌ قَالَ :وَأَنْشَدَنَا أَبُو بَكْرٍ مُحَمَّدُ بْنُ أَحْمَدَ بْنِ هَارُونَ الْعَسْكَرِيُّ قَالَ : أَنْشَدَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ الْجُنَيْدِ لِبَعْضِ الْمُتَعَبِّدِينَ:

أَلَا رُبَّ ذِي طِمْرَيْنِ أَشْعَثَ أَغْبَرَا ... يُدَافِعُ بِالْأَبْوَابِ إِذْ ظَلَّ مُعْسِرًا

مُطِيعٌ يَخَافُ اللَّهَ فِي كُلِّ أَمْرِهِ ... يَكَادُ مِنَ الْأَحْزَانِ أَنْ يَتَفَطَّرَا

وَلَوْ يُقْسِمَنَّ أَلْفًا عَلَيْهِ أَبَرَّهُ ... وَكَانَ حَقِيقًا أَنْ يُجَابَ وَيُجْبَرَا

٣١ .محمد هەواڵی پێداین وتی : أبوبکر محمد بن أحمد بن هارون العسكري سروودی بۆ وتین و وتی : إبراهيم بن الجنيد سروودی بۆ وتین بۆ هەندێ لە خواپەرستان :

بەدڵنیاییەوە ڕەنگە خاوەن پۆشاکێکی دڕاو و کۆن، قژ ئاڵۆزی خۆڵاوی

لەلای دەرگاکانەوە پاڵبنرێ کاتێ هەژارە

گوێڕایەڵیکارە لەهەموو کارێکدا لەالله دەترسێ
خەریکە لەخەم و پەژارەدا پارچە پارچە ئەبێت

ئەگەر هەزارجاریش سوێندبخوات لەسەری قبوڵی دەکات
واش شایستەتربووە کە وەڵام بدرێتەوە و شکاویی چاکبکرێتەوە

٣٢ .أَخْبَرَنَا مُحَمَّدٌ قَالَ :ثَنَا أَبُو مُحَمَّدِ بْنُ صَاعِدٍ قَالَ :ثَنَا الْحُسَيْنُ بْنُ الْحَسَنِ قَالَ : أَخْبَرَنَا الْفَضْلُ بْنُ مُوسَى قَالَ :ثَنَا حَزْمُ بْنُ مِهْرَانَ الْقُطَعِيُّ قَالَ :سَمِعْتُ مُعَاوِيَةَ بْنَ قُرَّةَ يَقُولُ :بَلَغَنَا أَنَّ كَعْبًا , كَانَ يَقُولُ " :طُوبَى لَهُمْ طُوبَى لَهُمْ , فَقِيلَ :وَمَنْ هُمْ يَا أَبَا إِسْحَاقَ؟ قَالَ :طُوبَى لَهُمْ إِنْ شَهِدُوا لَمْ يَدْخُلُوا , وَإِنْ خَطَبُوا لَمْ يَنْكِحُوا وَإِنْ مَاتُوا لَمْ يُفْتَقَدُوا"

٣٢ .پێمان گەیشتووە کعب وتویەتی : خۆشبەختی بۆ ئەوان، خۆشبەختیی بۆ ئەوان، وترا ئەوان کێن ئەی باوکی اسحاق؟
وتی : خۆشبەختیی بۆ ئەوان کاتێ شایەتی درا ئەوان ناکرێنەژوورەوە، ئەگەر بچنە داوای کچ لێیان مارەناکرێ، وە ئەگەر بمرن کەس هەواڵیان ناپرسێ و بیریان ناکەن.

[واتە ئەوەندە نامۆ و بێزراون لای خەڵکی بەوشێوەیە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێ واللّٰه اعلم] .

كتاب السلف

٣٣.قال أبوبكر محمد بن الحسين:حَدَّثَنِي بَعْضُ أَصْحَابِنَا عَنْ أَبَى الْفَضْلِ الشَّكَلِيِّ قَالَ :رَأَيْتُ شَابًّا فِي بَعْضِ الطَّرِيقِ وَعَلَيْهِ خِلَقٌ فَكَأَنِّي لَمْ أَحْفَلْ بِهِ , فَالْتَفَتَ إِلَيَّ ثُمَّ قَالَ:

لَا تَنْأَ عَنِّي بِأَنْ تَرَى خِلَقِي ... فَإِنَّمَا الدُّرُّ دَاخِلُ الصَّدَفِ
عِلْمِي جَدِيدٌ وَمَلْبَسِي خَلَقٌ ... وَمُنْتَهَى اللُّبْسِ مُنْتَهَى الصَّلَفِ

قَالَ :فَجَعَلْتُ أَلُوذُ بِهِ وَأَنِسْتُ بِهِ

٣٣ .أبي الفضل الشكلي وتى : گەنجێكم بینی لە ڕێگا جلێكی كۆنی لەبەردابوو ،وەک بڵێی پێشتر پێی نەگەیشتبم، ئاوڕیدایەوە بۆلام، پاشان وتی :

بەزەییت پێما نێیەتەوە بەوەی جلە كۆن و دڕاوەكانم ببینی
چونكە بەڕاستی مرواری لەنێو سەدەفدایە

زانستەكەم نوێیە و جلەكانم كۆنە
چونكە پۆشینی پۆشاكی ئەوپەڕی جوان لە ئەوپەڕی زیادی ئەندازە و خۆبەگەورەزانییە

وتی : لە باوەشم كرد، وە زۆر پێی دڵخۆشم بووم.

٣٤.أَخْبَرَنَا مُحَمَّدٌ قَالَ :وَحَدَّثَنَا الْفِرْيَابِيُّ قَالَ :ثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ عُبَيْدِ بْنِ أَبِي كَرِيمَةَ الْحَرَّانِيُّ قَالَ :ثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ سَلَمَةَ الْحَرَّانِيُّ , عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحِيمِ , عَنْ أَبِي عَبْدِ الْمَلِكِ , عَنِ الْقَاسِمِ , عَنْ أَبِي أُمَامَةَ , عَنْ نَبِيِّ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ» :إِنَّ أَغْبَطَ النَّاسِ عِنْدِي لَمُؤْمِنٌ خَفِيفُ الْحَاذِ ذُو حَظٍّ مِنْ صَلَاةٍ , أَحْسَنَ عِبَادَةَ رَبِّهِ عَزَّ وَجَلَّ , وَكَانَ رِزْقُهُ كَفَافًا , لَا يُشَارُ إِلَيْهِ بِالْأَصَابِعِ , وَصَبَرَ عَلَى ذَلِكَ حَتَّى يَلْقَى اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ ثُمَّ حَلَّتْ مَنِيَّتُهُ وَقَلَّ تُرَاثُهُ وَقَلَّتْ بَوَاكِيهِ.«

٣٤ .پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ﴿باشترین کەس لە حاڵ و باری لای من ئەو بڕوادارەیە کە بارودۆخی سووک و ئاسانە، بەشێکی هەیە لەنوێژ، بەجوانی پەرستشی پەروەردگاری دەکات، وە رزق و خواردنەکەی بەپێی پێویستییەتی نە زۆرە نە کەم، ئاماژەی پێناکرێ بەپەنجەی دەست و لەسەری ئارام دەگرێ هەتا ئەگات بەدیداری اللە عَزَّ وَجلَّ و مردنی پێئەگات، میراتەکەی کەمە و ئەوکەسانەشی بۆی ئەگرین کەمن﴾.

٣٥.أَخْبَرَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْحُسَيْنِ قَالَ :أَنْشَدَنِي أَبُو بَكْرٍ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ حُمَيْدٍ الْمُؤَدِّبُ فِي ذَلِكَ:

أَخَصُّ النَّاسِ بِالْإِيمَانِ عَبْدٌ ... خَفِيفُ الْحَاذِ مَسْكَنُهُ الْقِفَارُ

لَهُ فِي اللَّيْلِ حَظٌّ مِنْ صَلَاةٍ ... وَمِنْ صَوْمٍ إِذَا جَاءَ النَّهَارُ

وَقُوتُ النَّفْسِ يَأْتِي فِي كَفَافٍ ... وَكَانَ لَهُ عَلَى ذَاكَ اصْطِبَارُ

وَفِيهِ عِفَّةٌ وَبِهِ خُمُولٌ ... إِلَيْهِ بِالْأَصَابِعِ لَا يُشَارُ

وَقَلَّ الْبَاكِيَاتُ عَلَيْهِ لَمَّا ... قَضَى نَحْبًا وَلَيْسَ لَهُ يَسَارُ

فَذَلِكَ قَدْ نَجَا مِنْ كُلِّ شَرٍّ ... وَلَمْ تَمْسَسْهُ يَوْمَ الْبَعْثِ نَارُ

٣٥ .هەواڵی پێداین محمد بن الحسين وتی : أبوبكر عبدالله بن حميد المؤدب سرووودی لەمەدا بۆ وتم :

تایبەتترین کەسەکان بە باوەڕ

کەسێکە باری کەم و سووکە شوێنی

نیشتەجێبوونی زەویيەکی چۆڵە

لەشەودا بەشێکی هەیە لە هەڵسان

کە ڕۆژیش هات ڕۆژووگرتن

وە خواردنەکەی بەپێی پێویستە

وە لەسەر ئەوە ئارامگرتنی هەیە

پاکێتی تیایە و کەسێکی شاراوەیە
بەپەنجەی دەست ئاماژەی بۆ ناکرێ

وە کەمن ئەوانەی ئەگرین لەسەری
کاتێ گەیشتە مردن و سامان و سەروەتی زۆریشی نیە

ئەمە ڕزگاری بووە لەهەموو خراپەیەک
وە ڕۆژی زیندووبوونەوەش ئاگری پێناکەوێت

٣٦ .أَخْبَرَنَا مُحَمَّدٌ قَالَ :ثَنَا أَبُو عَبْدِ اللَّهِ مُحَمَّدُ بْنُ مَخْلَدٍ الْعَطَّارُ قَالَ :حَدَّثَنَا أَبُو جَعْفَرٍ مُحَمَّدُ بْنُ عُثْمَانَ بْنِ أَبِي شَيْبَةَ قَالَ :حَدَّثَنِي عَلِيُّ بْنُ حَكِيمٍ قَالَ :أَخْبَرَنَا حُمَيْدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الرُّؤَاسِيُّ , عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ مُسْلِمٍ الطَّائِفِيِّ , عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَوْسٍ , عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ هُرْمُزَ , عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ " :أَحَب شَيْءٍ إِلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ الْغُرَبَاءُ , قِيلَ :وَمَا الْغُرَبَاءُ؟ قَالَ :الْفَرَّارُونَ بِدِينِهِمْ يُجْمَعُونَ إِلَى عِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ عَلَيْهِ السَّلَامُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ "

٣٦ .عبدالله بن عمرو وتی : خۆشەویسترین شت لای الله عَزَّ وَجلَّ نامۆکانن.
وترا : نامۆکان کێن ؟

وتی : ئەوانەی بەدینەکەیان ڕادەکەنە لا عیسی ی کوڕی مەریەم علیەالسلام کۆدەکرێنەوە لە قیامەتدا.

٣٧ .أَخْبَرَنَا مُحَمَّدٌ قَالَ :أَنْبَا الْفِرْيَابِيُّ قَالَ :ثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ إِبْرَاهِيمَ الدِّمَشْقِيُّ قَالَ :ثَنَا ابْنُ أَبِي فُدَيْكٍ قَالَ :حَدَّثَنِي يَحْيَى بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي قَتَادَةَ , عَنْ نَافِعِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ :دَخَلَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ الْمَسْجِدَ فَوَجَدَ مُعَاذَ بْنَ جَبَلٍ رحمه الله جَالِسًا إِلَى بَيْتِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ يَبْكِي , فَقَالَ لَهُ عُمَرُ :مَا يُبْكِيكَ يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ هَلَكَ أَخُوكَ - لِرَجُلٍ مِنْ أَصْحَابِهِ - هَلَكَ قَالَ :لَا , وَلَكِنَّ حَدِيثًا حَدَّثَنِيهِ حِبِّي صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَنَا فِي هَذَا الْمَسْجِدِ , فَقَالَ :مَا هُوَ يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ؟ قَالَ :أَخْبَرَنِي» أَنَّ اللَّهَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى يُحِبُّ الْأَخْفِيَاءَ الْأَتْقِيَاءَ الْأَبْرِيَاءَ , الَّذِينَ إِذَا غَابُوا لَمْ يُفْتَقَدُوا , وَإِنْ حَضَرُوا لَمْ يُعْرَفُوا , قُلُوبُهُمْ مَصَابِيحُ الْهُدَى يَخْرُجُونَ مِنْ كُلِّ فِتْنَةٍ عَمْيَاءَ مُظْلِمَةٍ «

٣٧ .نافع بن مالک وتی : عمر بن خطاب ـ رضي الله عنه ـ هاتە مزگەوتەوە و بینی معاذی کوڕی جبل دانیشتووە بەلای ماڵی رسول الله ﷺ و دەگریا، عمر پێی فەرموو : چی دەتگریێنێت ئەی باوکی عبدالرحم ؟

براکەت ) یەکێک لە هاوڕێکانی معاذ( مردووە ؟

وتی : نەخێر بەڵام فەرموودەیەک خۆشەویستەکەم پێی فەرمووم لەم مزگەوتەدا.

عمر فەرمووی : چیە ئەم فەرموودەیە ئەی باوکی عبدالرحمن؟

كتاب السلف

وتى : پێی ڕاگەیاندم کە الله عَزَّ وَجل بەندە شاراوە پارێزکارە دوور لەسیفەتە ناشرینەکانی خۆشدەوێت ئەوانەی کاتێ دیارنەبن هیچ کەسێ لێیان ناپرسێ و بیریان ناکەن، وە کاتێ ئامادەبن ناناسرێن، دڵیان چرای هیدایەت و ڕێنوێنیە، لە هەموو فیتنەیەکی کوێر و تاریک دەهێنرێنە دەرەوە و ڕزگاریان ئەبێ .

## ﴿ بَابُ ذِكْرِ مَنْ كَانَ يُحِبُّ الْغُرْبَةَ وَيُخْفِي نَفْسَهُ وَيَنْتَقِلُ مِنْ مَوْضِعٍ إِلَى مَوْضِعٍ ﴾

## | دەروازەی باسێک دەربارەی ئەو کەسەی حەزی بە نامۆبوونە و خۆی دەشارێتەوە و دەگوازێتەوە لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر |

٣٨ .أَخْبَرَنَا مُحَمَّدٌ بْنُ الْحُسَيْنِ قَالَ :حَدَّثَنَا أَبُو الْفَضْلِ الْعَبَّاسُ بْنُ يُوسُفَ الشَّكَلِيُّ قَالَ :حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ إِسْحَاقَ السُّلَمِيُّ قَالَ :حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ صَالِحٍ التَّيْمِيُّ قَالَ : قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ مُؤَذِّنُ مَسْجِدِ بَنِي حَرَامٍ " :جَاوَرَنِي شَابٌّ , فَكُنْتُ إِذَا أَذَّنْتُ لِلصَّلَاةِ وَأَقَمْتُ فَكَأَنَّهُ فِي نَقْرَةِ قَفَايَ , فَإِذَا صَلَّيْتُ صَلَّى ثُمَّ لَبِسَ نَعْلَيْهِ ثُمَّ دَخَلَ مَنْزِلَهُ , فَكُنْتُ أَتَمَنَّى أَنْ يُكَلِّمُنِي أَوْ يَسْأَلَنِي حَاجَةً , فَقَالَ لِي ذَاتَ يَوْمٍ :يَا أَبَا عَبْدِ اللَّهِ عِنْدَكَ مُصْحَفٌ تُعِيرُنِي أَقْرَأُ فِيهِ؟ فَأَخْرَجْتُ إِلَيْهِ مُصْحَفًا فَدَفَعْتُهُ إِلَيْهِ , فَضَمَّهُ إِلَى صَدْرِهِ ثُمَّ قَالَ :لَيَكُونَنَّ الْيَوْمَ لِي وَلَكَ شَأْنٌ , فَفَقَدْتُهُ ذَلِكَ الْيَوْمَ فَلَمْ أَرَهُ يَخْرُجُ فَأَقَمْتُ لِلْمَغْرِبِ فَلَمْ يَخْرُجْ , وَأَقَمْتُ لِعِشَاءِ الْآخِرَةِ فَلَمْ يَخْرُجْ , فَسَاءَ ظَنِّي , فَلَمَّا صَلَّيْتُ عِشَاءَ الْآخِرَةِ جِئْتُ إِلَى الدَّارِ الَّتِي هُوَ فِيهَا , فَإِذَا فِيهَا دَلْوٌ وَمِطْهَرَةٌ , وَإِذَا عَلَى بَابِهِ سِتْرٌ , فَدَفَعْتُ الْبَابَ فَإِذَا بِهِ مَيِّتًا وَالْمُصْحَفُ فِي حِجْرِهِ فَأَخَذْتُ الْمُصْحَفَ مِنْ حِجْرِهِ وَاسْتَعَنْتُ بِقَوْمٍ عَلَى حَمْلِهِ حَتَّى وَضَعْنَاهُ عَلَى سَرِيرِهِ , وَبَقِيتُ لَيْلَتِي أُفَكِّرُ مَنْ أُكَلِّمُ حَتَّى يُكَفِّنَهُ , فَأَذَّنْتُ لِلْفَجْرِ بِوَقْتٍ وَدَخَلْتُ الْمَسْجِدَ لِأَرْكَعَ فَإِذَا بِضَوْءٍ فِي الْقِبْلَةِ ,فَدَنَوْتُ مِنْهُ فَإِذَا كَفَنٌ مَلْفُوفٍ فِي الْقِبْلَةِ فَأَخَذْتُهُ , وَحَمِدْتُ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ , وَأَدْخَلْتُهُ الْبَيْتَ وَخَرَجْتُ , فَأَقَمْتُ الصَّلَاةَ فَلَمَّا سَلَّمْتُ فَإِذَا عَنْ يَمِينِي ثَابِتٌ الْبُنَانِيُّ وَمَالِكُ بْنُ دِينَارٍ وَحَبِيبٌ الْفَارِسِيُّ وَصَالِحٌ الْمُرِّيُّ , فَقُلْتُ لَهُمْ :يَا إِخْوَانِي مَا غَدَا بِكُمْ؟

قَالُوا لِي :مَاتَ فِي جِوَارِكَ اللَّيْلَةَ أَحَدٌ؟ قُلْتُ :مَاتَ شَابٌّ وَكَانَ يُصَلِّي مَعِيَ الصَّلَوَاتِ , فقَالُوا لِي :أَرِنَاهُ , فَلَمَّا دَخَلُوا عَلَيْهِ كَشَفَ مَالِكُ بْنُ دِينَارٍ الثَّوْبَ عَنْ وَجْهِهِ ثُمَّ قَبَّلَ مَوْضِعَ سُجُودِهِ , ثُمَّ قَالَ :بِأَبِي أَنْتَ يَا حَجَّاجُ , إِذَا عُرِفْتَ فِي مَوْضِعٍ تَحَوَّلْتُ مِنْهُ إِلَى مَوْضِعٍ غَيْرِهِ حَتَّى لَا تُعْرَفَ , خُذُوا فِي غُسْلِهِ , وَإِذَا مَعَ كُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمْ كَفَنٌ , فَقَالَ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمْ :أَنَا أُكَفِّنُهُ , فَلَمَّا طَالَ ذَلِكَ مِنْهُمْ قُلْتُ لَهُمْ :إِنِّي فَكَّرْتُ فِي أَمْرِهِ هَذِهِ اللَّيْلَةَ فَقُلْتُ :مَنْ أُكَلِّمُ حَتَّى يُكَفِّنَهُ , فَأَتَيْتُ الْمَسْجِدَ فَأَذَّنْتُ ثُمَّ دَخَلْتُ لِأَرْكَعَ فَإِذَا كَفَنٌ مَلْفُوفٌ لَا أَدْرِي مَنْ وَضَعَهُ , فَقَالُوا :يُكَفَّنُ فِي ذَلِكَ الْكَفَنِ , فَكَفَّنَّاهُ وَأَخْرَجْنَاهُ , فَمَا كِدْنَا نَرْفَعُ جَنَازَتَهُ مِنْ كَثْرَةِ مَنْ حَضَرَهُ مِنَ الْجَمْعِ"

٣٨ .محمد بن عبدالله التيمي وتى : أبو عبدالله بانگبێژی مزگەوتی بني حرام وتى : گەنجێک لەتەنیشتمەوە بوو، کاتێ کە بانگم دەدا و إقامەم ئەکرد بۆ نوێژ وەک چاڵێکی بچووک وابوو، کە نوێژم دەکرد ئەویش نوێژی دەکرد، پاشان نەعلەکانی لەپێ کرد، پاشان ڕۆیشتەوە بۆ ماڵەکەی، ئاواتە خوازبووم قسەیەک بکات لەگەڵم یان داوای پێویستییەکم لێبکات، ڕۆژێک پێی وتم : ئەی باوکی عبدالله قورئانێکت لایە پێمی بدەیت تیایدا بیخوێنمەوە ؟

منیش قورئانێکم بۆ دەرهێنا و پێمدا، ئەویش خستی بەسینگییەوە و لەباوەشی کرد، پاشان وتی : ئەمڕۆ بۆمن ئەبێت و تۆش پێگە و ڕێزێکت ئەبێت .

ئەوڕۆژە بیرم ئەکرد و نەمبینی دەربچێت، بۆ نوێژی شێوان مامەوە هەر نەهاتە دەرەوە، بۆ نوێژی عیشا ش مامەوە هەر نەهاتەدەرەوە، گومانم خراپ بوو، بۆیە

کاتێ نوێژی عیشام کرد چووم بۆ ئەو ماڵەی کەتێیدابوو، بینیم دۆلکەیەک و پاککەرەوەیەکی لێبوو، وە لەسەر دەرگاکەی پەردەیەکی پێوەبوو، دەرگاکەم پاڵنا بینیم مردوویەکی لێبوو قورئانێک لەکۆشیایەتی، قورئانەکەم لەسەر کۆشی برد و داوای یارمەتیم لە هەندێ کەسم کرد هەتا هەڵمان گرت و بردمانە سەر جێگاکەی، ئەو شەوە هەر بیرم ئەکردەوە لەگەڵ کێ قسە بکەم تا کفنی بکەین، لەکاتی خۆیدا بانگمدا بۆ نوێژی بەیانی، چوومە مزگەوت تا نوێژبکەم، ڕووناکییەکم بینی لە قیبلەوە، لێی نزیک بوومەوە بینیم کفنێکی پێچراوی لێیە و بردم، سوپاسی الله تعالى م کرد، خستمە ژوورەوە و خۆشم هاتمە دەرەوە، نوێژەکەم کرد و کاتێ سەلامم دایەوە بینیم لەلای ڕاستم ثابت البناني و مالیکی کوڕی دینار و حبیب ی فارسیی و صالح المري لێیە، پێم وتن : ئەی براکانم بەم بەیانییە چی ئێوەی هێناوە ؟

پێیان وتم : ئەمشەو کەسێک لەتەنیشت تۆوە مردووە ؟

وتم : گەنجێک مردووە، نوێژەکانی لەگەڵ من ئەکرد.

وتیان : نیشانمان بدە.

کاتێ چوونە ژوورەوە بۆ لای و مالیکی کوڕی دینار پۆشاکەکەی لادا لەسەر ڕووخساری و شوێنی سوجدە بردنەکەی ماچکرد، پاشان وتی : باوکم بەفیدات بێ ئەی حەجاج، کاتێ لەشوێنێک ناسرابایت دەتگۆڕی بۆ شوێنێکی تر هەتا نەناسرێیت، بیبەن بۆ شوێنی شووشتنەکەی.

هەریەکێکیان کفنێکی پێبوو، هەریەکێکیان دەیوت من کفنی دەکەم، کاتێ ئەمە زۆری خایاند پێم وتن : من بیرم لەو کارە دەکردەوە ئەمشەو وتم لەگەڵ کێ قسەبکەم تا کفنی بکات، هاتم بۆ مزگەوت بانگمدا، هاتمە ژوورەوە تا نوێژبکەم کفنێکم بینی پێچرابوو نەمزانم کێ لەوێی دانابوو.

وتیان : لەو کفنەدا کفن دەکرێ.

کفنمان کرد و هێنامانە دەرەوە، نەماندەتوانی هەڵیبگرین لەبەر زۆریی ئەو خەڵکەی لەوێ ئامادەبوون .

٣٩.أَخْبَرَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْحُسَيْنِ قَالَ :أَنْشَدَنَا أَبُو الْفَضْلِ الْعَبَّاسُ بْنُ يُوسُفَ الشَّكَلِيُّ قَالَ :أَنْشِدْنِي بَعْضُ أَصْحَابِنَا:

أَلَا رُبَّ ذِي طِمْرَيْنِ فِي مَجْلِسٍ غَدَا ... زَرَابِيُّهُ مَبْثُوثَةٌ وَنَمَارِقُهْ

قَدِ اطَّرَدَتْ أَنْهَارُهُ فِي رِيَاضِهِ ... مَعَ الْحُورِ وَالْتَفَتَّ عَلَيْهِ حَدَائِقُهْ

مَحَلَّ دِيَارٍ إِنْ حَلَلْتَ دِيَارَهَا ... نَعِمْتَ بِدَارِ الْخُلْدِ مَعَ مَنْ تُرَافِقُهْ

رَفِيقٌ وَجَارٌ لِلنَّبِيِّ مُحَمَّدٍ ... لَقَدْ أُعْطِي الزُّلْفَى رَفِيقً يُرَافِقُهْ

فَيَا حُسْنَ عَبْدٍ جَاوَرَ اللَّهَ رَبَّهُ ... بِدَارِ الْغِنَى وَالْغَانِيَاتُ تُعَانِقُهْ

وَيَا حُسْنَهُ وَالْحَوْرُ يَمْشِينَ حَوْلَهُ ... عَلَى فُرُشِ الدِّيبَاجِ سُبْحَانَ خَالِقُهْ

٣٩ .محمد بن الحسين هەواڵی پێداین وتی : أبو الفضل العباس بن یوسف الشکلي سروودێکی بۆ وتین و وتی هەندێ لە هاوڕێکانم سروودی بۆ وتم :

ڕەنگە سبەی خاوەن جلێکی کۆن و دڕاو لە دانیشتگەیەکدایە
ڕایەخەکانی و پاڵەپشتی جوان و ڕەنگا و ڕەنگ ڕاخراوە و جوان ڕێکخراون

ڕووبارەکانی لەنێو باخەکانی بەبەردەوامی ئەڕوات
لەگەڵ حۆرییەکان و باخەکانی دەوریان داون

شوێنی کەسێکە ئەگەر بچێتە ناوی
بەهەرەوەر دەبێت لە ماڵی مانەوەیی هەمیشەی لەگەڵ هەرکەسێک حەز بەهاوەڵی بکەیت

هاوڕێ و هاوسێی پەیامبەر محمد
پێی بەخشراوە نزیکی و خۆش جێگەیی هەرکەسێ هاوەڵی بکات

٤٠ .قَالَ أَخْبَرَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْحُسَيْنِ قَالَ :وَحَدَّثنا أَبُو الْفَضْلِ الشَّكَلِيُّ , أَيْضًا قَالَ : حَدَّثَنِي الْحُسَيْنُ بْنُ أَحْمَدَ الْأَزْدِيُّ قَالَ " :قَدِمَ الْمَصِّيصَةَ فَتًى مِنَ الْمُتَعَبِّدِينَ , فَنَزَلَ فِي مَسْجِدِ أَسَدٍ الْخَشَّابِ , وَكَانَ يَسْمَعُ مِنَ النَّاسِ الْحَدِيثَ , وَكَانَ عَلَيْهِ أَطْمَارٌ , وَكَانَ

نَاحِلَ الْجِسْمِ ذَابِلًا فَأَشْرَفَ أَسَدٌ عَلَى بَعْضِ اجْتِهَادِهِ فَقَرَّبَهُ وَأَدْنَاهُ وَخَصَّهُ بِالْحَدِيثِ , فَلَمَّا رَأَى ذَلِكَ مِنْ فِعْلِهِ هَرَبَ مِنْهُ فَافْتَقَدَهُ فَحَزِنَ عَلَيْهِ حزْنًا شَدِيدًا , فَأَنْشَأَ يَقُولُ:

يَا مَنْ رَأَى لِي غَرِيبًا ... ثِيَابُهُ أَطْمَارُ
الْجِسْمُ مِنْهُ نَحِيلٌ ... وَالْوَجْهُ فِيهِ اصْفِرَارُ
عَلَيْهِ آثَارُ حُزْنٍ ... بِوَجْهِهِ وَاغْبِرَارُ
يَقُومُ فِي جَوْفِ لَيْلٍ ... يُنَاجِي الْجَبَّارَ
يَقُولُ يَاسُؤَلَ قَلْبِي ... يَا مَاجِدٌ غَفَّارُ
فَالدَّمْعُ يَجْرِي بِحُزْنٍ ... فَدَمْعُهُ مِدْرَارُ
يَبْغِي جِنَانَ نَعِيمٍ ... يَا حُسْنَ دَارِ الْقَرَارِ
فِيهَا جَوَارٍ حِسَانٌ ... يَا حُسْنَ تِلْكَ الْجِوَارِ
عَرَائِسُ فِي خِيَامٍ ... مِنَ اللَّآلِئِ الْكِبَارِ
كَوَاعِبُ غَنِجَاتٌ ... نَوَاهِدُ أَبْكَارُ
لِبَاسُهُنَّ حَرِيرٌ ... يُحَيِّرُ الْأَبْصَارَ
وَفِي الذِّرَاعِ سِوَارٌ ... يَا حُسْنَهُ مِنْ سِوَارٍ
شَرَابُهُنَّ رَحِيقٌ ... يُفَجِّرُ الْأَنْهَارَ
وَسَلْسَبِيلٌ وَخَمْرٌ ... تَبَارَكَ الْجَبَّارُ
يَا مَنْ رَأَى لِي غَرِيبًا ... ثِيَابُهُ أَطْمَارُ

٤٠. الحسين بن أحمد الأزدي وتى : گەنجێک لە خواپەرستان هاتە شاری مصیصە و لایدا لە مزگەوتی أسدی دارتاش و گوێی لە حدیث دەگرت، جلێکی کۆن و دڕاوی لەبەربوو، جەستەیەکی لاوازی نەخۆشی هەبوو، أسد یش ئاگاداری هەندێ لە کۆششەکانی بوو، نزیکی کردەوە لە خۆی و تایبەتی کرد بە حدیث، گەنجەکەش کاتێ ئەمەی بینی لە کردارەکانی ڕایکرد لێی [واتە بۆیە ڕایکردووە تا بەناوبانگ و ناسراو نەبێت لای خەڵکی، یاخود بەچاوێکی بەرزترەوە سەیر بکرێت]، أسد یش زۆر بیری کرد و خەمباربوو و ئەم سرووودەی وت:

ئەی ئەو کەسەی نامۆکەی منی بینیوە
کە جلەکانی کۆن و دڕاون

لاشەیەکی لاوازی هەیە
و ڕووخسارێکی ڕەنگ زەرد

شوێنەواری خەم و پەژارە
بە ڕووخسارییەوەیەتی لەگەڵ تەپ و تۆز

لەنیوە شەودا هەڵدەستێ
موناجات ئەکات لەگەڵ الجبار

كتاب السلف

ئەڵێ : ئەی داواکاریی دڵم
ئەی بەرز و بڵند ئەی لێخۆشبوو

فرمێسک ئەڕژێت بە خەم و پەژارەوە
فرمێسکەکەی بەلێزمەیە

داوای بەهەشتی پڕ ناز ونیعمەت ئەکات
ئای چەند جوانە ماڵی هەمیشەیی
تێیدایە

بووکانێک لەنێو خێمەکاندا
لە مرواریە گەورەکان

تازەپێگەیشتووی چاوەکانیان وەک دەریا وایە
وە سینگیان گەورەیە

پۆشاکیان لە ئاوریشمە
خاوەن چاوەکان سەرلێ دەشێوێنێ

لەدەستیان بازن هەیە

چی بازنێکی جوان

خواردنەوەکانیان گوڵاوە
لەڕووبارەکان هەڵدەقوڵێ

ئاوی سەلسەبیل و شەڕاب
پاک و بێگەردیی بۆ بەدەسەڵاتی ناچارکەر

ئەی ئەو کەسەی نامۆکەی منی بینیوە
کە جلەکانی کۆن و دڕاون

٤١ .أَخْبَرَنَا مُحَمَّدٌ قَالَ :حَدَّثَنَا أَبُو عَبْدِ اللَّهِ مُحَمَّدُ بْنُ مَخْلَدٍ الْعَطَّارُ , قَالَ :حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرٍ أَحْمَدُ بْنُ عَتَّابٍ قَالَ :سَمِعْتُ أَبَا بَكْرٍ بْنَ مُسْلِمٍ يَقُولُ:

يَا مَنْ يُرِيدُ بِزَعْمِهِ الْإِخْمَالَا ... إِنْ كَانَ حَقًّا فَاسْتَعِدَّ خِصَالَا
تَرْكُ التَّذَاكُر وَالْمَجَالِسِ كُلِّهَا ... وَاجْعَلْ خُرُوجَكَ لِلصَّلَاةِ خَيَالَا
بَلْ كُنْ بِهَا حَيًّا كَأَنَّكَ مَيِّتٌ ... لَا يَرْتَجِي مِنْهُ الْقَرِيبُ وِصَالَا
وَأْنَسْ بِرَبِّكَ وَاعْلَمَنْ بِأَنَّهُ ... عَوْنُ الْمُرِيدِ يُسَدِّدُ الْإِخْلَالَا
يُعْطِي وَيُثْنِي بِالْعَطَاءِ تَفَضُّلًا ... بَعْدَ الثَّوَابِ وَيَبْسُطُ الْآمَالَا

كتاب السلف

مَنْ ذَا يُرِيدُ مَعَ الْوَدُودِ مُؤْنِسًا ... مَنْ ذَا يُرِيدُ لِغَيْرِهِ أشْغَالَا

مَنْ ذَا يَلَذُّ بِغَيْرِ ذِكْرِ مَلِيكِهِ ... مَنْ ذَا يُرِيدُ لِغَيْرِهِ أَعْمَالَا

لَا تَقْنَعَنَّ مِنَ الْحَيَاةِ بِغَيْرِهِ ... وَابْذُلْ قُوَاكَ وَقَطِّعِ الْأَوْصَالَا

فَلَئِنْ بَلَغْتَ لَأَنْتَ أَكْرَمُ مَنْ بِهَا ... وَلَئِنْ هَلَكْتَ فَمَا ظَلَمْتَ حَلَالًا

مَنْ ذَاقَ كَأْسَ الْخَوْفِ ضَاقَ بِذَرْعِهِ ... حَتَّى يَنَالَ مُرَادَهُ إِنْ نَالَا

حَاشَا مُؤَمِّلٍ سَيِّدِي مِنْ خَيْبَةٍ ... جَلَّ الْجَوَادُ بِفِعْلِهِ وَتَعَالَا

٤١ .أبابكر دەیوت :

ئەی ئەو کەسەی بەگومانی خۆی تەواوپی ئەوێت

ئەگەر ڕاست بێ ئەوا تایبەتمەندییەکانت ئامادەبکە

وازبێنە لەگشت  باسکردن و دانیشتگەکان

وە ڕۆیشتن بۆ مزگەوت بکە لە تاریکایی

بەڵکو وابکە پێی بژیت وەک کەسێکی مردوو

کەسی زیندوو ئومێدی گەیشتنی پێ نەبێ

وە هۆگر ببە بە پەروەردگارت و بزانە بەڕاستی

یارمەتیدەرە بۆ ئەوەی دەیەوێت و کەموکوڕیەکانی ڕاست بکاتەوە

كتاب السلف

دەبەخشێت و بەبەخشین پیاهەڵدان ئەکات وەک فەزڵێک
لەدوای پاداشت و هیواکان درێژدەکاتەوە

کێیە دەیەوێ لەگەڵ خۆشەویست هۆگرێکی هەبێ
کێ دەیەوێ بەغەیری ئەو سەرقاڵیی هەبێ

کێیە ئەوکەسەی چێژ دەبینێ بە جگە لەیادی پادشاکەی
کێ دەیەوێ کارەکانی بۆ جگە لەو بێ

لەژیاندا قەناعەتت نەبێ بە جگە لەو
وە هێزت بەگەڕ بخە و جومگەکان بپچڕێنە

کەپێی گەیشتی ئەوا تۆ ڕێزدارترینی لەوانەی لەوێن
وە ئەگەر بەهیلاکەتیش چوویت ئەوا تۆ داوای مەحاڵت نەکردووە

هەرکەسێ جامی ترس بنۆشێ تەنگی پێ هەڵئەچنێ
هەتا دەگات بەویستەکەی ئەگەر پێی گەیشت

حاشا لە ئومێدەوارێک بە گەورەکەم لە بێ ئومێدبوون

كتاب السلف

## بەقەدر و ڕێزە بەخشندە بە کردارەکانی و بڵندە

٤٢ .أَخْبَرَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْحُسَيْنِ قَالَ :حَدَّثَنَا أَبُو الْفَضْلِ الشَّكَلِيُّ قَالَ :حَدَّثَنِي سَعِيدُ بْنُ عُثْمَانَ الحَنَّاطُ قَالَ :سَمِعْتُ ذَا النُّونِ الْمِصْرِيَّ يَقُولُ " :بَيْنَا أَنَا فِي مَسِيْرِي إِذْ لَقِيَتْنِي امْرَأَةٌ مِنَ الْمُتَعَبِّدَاتِ , كَأَنَّهَا وَالِهَةٌ فَقَالَتْ لِي :مِنْ أَيْنَ أَنْتَ؟ فَقُلْتُ :أَنَا رَجُلٌ غَرِيبٌ , فَقَالَتْ لِي :يَا غَرِيبُ وَهَلْ تُوجَدُ مَعَ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ أَحْزَانُ الْغُرْبَةِ وَهُوَ مُؤْنِسُ الْغُرَبَاءِ وَمُعِينُ الضُّعَفَاءِ؟ قَالَ :فَبَكَيْتُ , فَقَالَتِ :اعْلَمْ أَنَّ الْبُكَاءَ رَاحَةٌ لِلْقَلْبِ وَمَلْجَأٌ يُلْجَأُ إِلَيْهِ , وَمَا كَتَمَ الْقَلْبُ شَيْئًا هُوَ أَوْلَى مِنَ الشَّهِيقِ وَالزَّفِيرِ , قُلْتُ :عَلِّمِينِي شَيْئًا , فَقَالَتْ :حِبَّ رَبَّكَ وَاشْتَقْ إِلَيْهِ , فَإِنَّ لَهُ يَوْمًا يَتَجَلَّى فِيهِ لِأَهْلِ مَحَبَّتِهِ فَيُنِيلُهُمْ مَا أَمَّلُوا مِنْ رُؤْيَتِهِ , ثُمَّ أَخَذْتُ فِي الشَّهِيقِ وَالزَّفِيرِ فَتَرَكْتُهَا عَلَى حَالِهَا وَمَضَيْتُ "

٤٢ .ذا النون المصري دەیوت : بەڕێگەدا دەڕۆیشتم، یەکێک لە ئافرەتە خواپەرستەکان بەلامدا تێپەڕی وەک بڵێی هۆشی ڕۆیشتبوو، پێی وتم : لە کوێوە هاتویت؟

وتم : من پیاوێکی نامۆم، پێی وتم : ئەی نامۆ ئایا لەگەڵ الله خەم و خەفەتی نامۆیی بوونی هەیە لەکاتێکا ئەو نەرم و نیان و جێی دڵخۆشیی ی نامۆکانە و یارمەتیدەری لاوازەکانە؟ وتی : گریام،

ئافرەتەکە وتی : بزانە گریان هۆکاری ئاسوودەبوونە بۆ دڵ و پەناگەیەکە پەنای بۆ دەبات، و دڵ هیچ شتێکی نەشاردۆتەوە گرنگتر بێت لە هەنیسک و دەنگی گریان.

پێم وت : شتێکم فێربکە.

وتی :پەروەردگارت خۆشبوێت و تامەزرۆی ببە، چونکە ئەو ڕۆژێکی هەیە تیایدا خۆی نیشان دەدات بەوانەی خۆشیویستوون و ئەوەیان بۆ دێنێتە دی کە ئاواتیان بوو لە بینینی پەروەردگاریان.

منیش دەستم کردەوە بە هەنیسک و گریان و لێی گەڕام لەسەر بارودۆخی خۆی و ڕۆیشتم .

٤٣ .أَخْبَرَنَا مُحَمَّدٌ قَالَ :حَدَّثَنِي أَبُو الْقَاسِمِ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ الْعَطَشِيُّ الْمُقْرِئُ قَالَ: حَدَّثَنِي إِبْرَاهِيمُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الْجُنَيْدِ قَالَ :حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ الْحُسَيْنِ الْبُرْجُلَانِيُّ قَالَ :حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ أَبِي عَبْدِ اللَّهِ الْخُزَاعِيُّ قَالَ :حَدَّثَنِي رَجُلٌ , مِنْ أَهْلِ الشَّامِ قَالَ " :صَحِبَنِي رَجُلٌ مِنَ النَّصَارَى , فِي بَعْضِ الطَّرِيقِ , فَقُلْتُ :أَيْنَ تُرِيدُ؟ فَقَالَ :أُرِيدُ رَاهِبًا هَا هُنَا أَقْتَبِسُ مِنْ عِلْمِهِ , قُلْتُ :أَجِيءُ مَعَكَ؟ قَالَ :إِنْ شِئْتَ قَالَ :فَأَتَيْنَا عَلَى كَهْفِ جَبَلٍ نَاحِيَةٍ عَنِ طَرِيقِ النَّاسِ قَالَ :فَوَقَفَ النَّصْرَانِيُّ فَنَادَى بِأَعْلَى صَوْتِهِ :يَا مُعَلِّمَ الْخَيْرِ أَتَيْتُكَ لِأَقْتَبِسَ مِنْ عِلْمِكَ خَيْرًا فَعَلِّمْنِي نَفَعَكَ اللَّهُ بِعِلْمِكَ قَالَ :فَهَتَفَ بِهِ هَاتِفٌ مِنْ دَاخِلِ الْكَهْفِ :أَيُّهَا السَّائِلُ عَنْ سُبُلِ الْمَنَافِعِ تَيَقَّظْ حِينَ يَغْفُلُ الْجَاهِلُونَ عَنْ أَنْفُسِهِمْ قَالَ :فَجَلَسَ النَّصْرَانِيُّ يَبْكِي , وَقَالَ :مَا أَرَاهُ إِلَّا مَرِيضًا , وَإِنِّي لَأَخَافُ أَنْ يَكُونَ قَدْ دَنَا أَجَلُهُ , وَمَا أَرَى أَنَّا نُمْطَرُ إِلَّا بِهِ , قَالَ :فَقُلْتُ :فَلَوْ دَخَلْنَا عَلَيْهِ قَالَ :إِنْ شِئْتَ قَالَ :فَانْحَدَرْنَا فِي الْكَهْفِ حَتَّى أَتَيْنَا عَلَى مَوْضِعٍ مِنْهُ وَعِرٍ , فَإِذَا بِشَيْخٍ كَبِيرٍ قَدْ سَقَطَ حَاجِبَاهُ عَلَى عَيْنَيْهِ , وَإِذَا هُوَ مَكْبُوبٌ عَلَى وَجْهِهِ , وَإِذَا هُوَ

يَقُولُ :لَئِنْ كُنْتَ أَطَلْتَ جَهْدِي فِي دَارِ الدُّنْيَا وَتُطِيلُ شَقَائِي فِي الْآخِرَةِ لَقَدْ أَهْمَلْتَنِي وَأَسْقَطْتَنِي مِنْ عَيْنِكَ أَيُّهَا الْكَرِيمُ ثُمَّ قَالَ :فَسَلَّمْنَا عَلَيْهِ فَرَفَعَ رَأْسَهُ فَإِذَا دُمُوعُهُ قَدْ بَلَّتِ الْأَرْضَ مِنْهَا , فَقَالَ :مَا أَدْخَلَكُمْ عَلَيَّ؟ أَلَمْ تَكُنِ الْأَرْضُ لَكُمْ وَاسِعَةً , وَأَهْلُهَا لَكُمْ أُنَاسًا؟ فَلَمَّا رَأَيْتُ مِنَ عَقْلِهِ مَا رَأَيْتُ , قُلْتُ :وَاللَّهِ إِنِّي لَأَرْغَبُ بِعَقْلِكَ عَنِ النَّارِ , فَبَكَى ,وَقَالَ :مَا الَّذِي آيَسَنِي عِنْدَكَ مِنْ رَحْمَةِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ الَّتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ؟ قَالَ : قُلْتُ :إِنَّ رَحْمَةَ اللَّهِ لَنْ يَنَالَهَا غَيْرُ أَهْلِ الْإِسْلَامِ دِينًا قَالَ :فَبَكَى ثُمَّ قَالَ :مَا أَعْرِفُ غَيْرَ الْإِسْلَامِ دِينًا قَالَ :فَاشْمَأَزَّ النَّصْرَانِيُّ وَقَالَ :يَا مُعَلِّمَ الْخَيْرِ تَرْغَبُ عَنِ النَّصْرَانِيَّةِ وَدِينِ الْمَسِيحِ؟ قَالَ :فَأَقْبَلَ عَلَيْهِ , فَقَالَ :ثَكِلَتْكَ أُمُّكَ , أَنَا عَلَى دِينِ الْمَسِيحِ , وَهَلْ كَانَ لِلْمَسِيحِ دِينٌ سِوَى الْإِسْلَامِ؟ إِنَّ اللَّهَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى لَمَّا خَلَقَ خَلْقَهُ ارْتَضَى لَهُمُ الْإِسْلَامَ دِينًا , فَمَنْ رَغِبَ عَنِ الْإِسْلَامِ فَلَا حَظَّ لَهُ فِي الْآخِرَةِ وَلَا نَصِيبَ قَالَ :فَثَارَ النَّصْرَانِيُّ مُوَلِّيًا قَالَ :فَقُلْتُ انْتَظِرْ حَتَّى أَخْرُجَ مَعَكَ قَالَ :فَقَالَ الرَّاهِبُ :دَعْهُ فَمَنْ كَتِبَ عَلَيْهِ الشَّقَاءُ لَمْ يَسْعَدْ أَبَدًا قَالَ :قُلْتُ :يَرْحَمُكَ اللَّهُ اعْتَزَلْتَ النَّاسَ وَاغْتَرَبْتَ فِي هَذَا الْمَوْضِعِ قَالَ :فَقَالَ :وَأَنْتَ أَيْ أُخَيَّ فَحَيْثُمَا ظَنَنْتَ أَنَّهُ أَقْرَبُ لَكَ إِلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ فَابْتَغِ إِلَى ذَلِكَ سَبِيلًا , فَلَنْ يجِدَ مُبْتَغُوهُ مِنْ غَيْرِهِ عِوَضًا , قَالَ :قُلْتُ :فَالْمَطْعَمُ؟ قَالَ: أَقِلَّ ذَلِكَ عِنْدَ الْحَاجَةِ إِلَيْهِ قَالَ :قُلْتُ :فَالْقِلَّةُ؟ فَقَالَ :إِذَا أَرَدْنَا ذَاكَ فَنبْتُ الْأَرْضِ وَقُلُوبُ الشَّجَرِ , قال :قُلْتُ :أُخْرِجُكَ مِنْ هَذَا الْمَوْضِعِ الْوَعِرِ , فَآتِي بِكَ أَرْضَ الرِّيفِ وَالْخِصْبِ؟ قَالَ :فَبَكَى , وَقَالَ :إِنَّمَا الْخِصْبُ حَيْثُ يُطَاعُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ , وَأَنَا شَيْخٌ كَبِيرٌ , وَإِنَّمَا أَمُوتُ الْآنَ وَلَا حَاجَةَ لِي بِالنَّاسِ قَالَ :قُلْتُ :أَوْصِنِي بِشَيْءٍ أَحْفَظُهُ عَنْكَ قَالَ :تَفْعَلُ؟ قُلْتُ :إِنْ شَاءَ اللَّهُ تَعَالَى قَالَ :لَا تَدَّخِرَنَّ عَنْ نَفْسِكَ مِنْ نَفْسِكَ شَيْئًا , وَلَا تُؤْثِرَنَّ بِحَظِّكَ مِنَ النَّاسِ أَحَدًا , وَارْعَ حُدُودَ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ عِنْدَ مُغَالَبَةِ الْهَوَى

وَتَنَسَّمْ إِلَى مَحَابِّهِ , وَإِنْ صَعُبَ عَلَيْكَ الْمُرْتَقَى , وَأُخْرَى أَقُولُهَا لَكَ جِمَاعًا لَا تَرُدَّ بِفِعْلِكَ غَيْرَهُ , وَالسَّلَامُ عَلَيْكَ ثُمَّ أَكَبَّ عَلَى وَجْهِهِ وَهُوَ يَبْكِي وَانْصَرَفْتُ "

٤٣ .محمد بن أبي عبدالله وتی : پیاوێک له خه‌ڵکی شام بۆی گێڕامه‌وه وتی : پیاوێک له نصاری له‌ڕێگه‌یه‌ک هاوڕێم بوو، وتم : ده‌ته‌وێ بچیته کوێ؟

وتی : ڕاهیبێکم ده‌وێت ئا له‌وێدا تا له علمه‌که‌یم به‌ده‌ست که‌وێت.

پێم وت : منیش بێم له‌گه‌ڵت ؟

وتی : ئه‌گه‌ر ویستت.

وتی : چوینه ئه‌شکه‌وتی گوندێک به‌لاوه بوو له ڕێگه‌ی خه‌ڵک، وتی : نصرانییه‌که وه‌ستا و به‌به‌رزترین ده‌نگی هاواری کرد : ئه‌ی مامۆستای چاکه، هاتووم له علمه چاکه‌که‌ت وه‌ربگرم، تۆش فێرم بکه،الله سوودت پێبگه‌یه‌نێ به‌هۆی علمه‌که‌ته‌وه.

وتی : بانگکه‌رێک له‌ناو ئه‌شکه‌وته‌که بانگی کرد : ئه‌ی داواکه‌ری ڕێگه‌کانی سوود وه‌رگرتن،هه‌ڵسه له‌خه‌و به‌ئاگابه له‌کاتێکدا نه‌زانه‌کان بێئاگان له‌نه‌فسی خۆیان .

وتی : نه‌صرانییه‌که دانیشت ده‌ستی کرد به‌گریان و وتی : ته‌نها به‌نه‌خۆشی ئه‌یبینم و ئه‌ترسم واده‌ی مردنی نزیکبووبێته‌وه، وائه‌بینم ته‌نها به‌هۆی ئه‌ووه بارانمان بۆ ئه‌بارێت.

وتم : ئه‌گه‌ر بچینه ژووره‌وه بۆلای، وتی : ئه‌گه‌ر ویستت،

وتی :لە ئەشکەوتەکەدا خلۆربووینەوە هەتا گەیشتینە شوێنێکی سەخت و ترسناک، پیرە پیاوێکمان بینی برۆکانی کەوتبۆوە سەر چاوەکانی و بەسەر دەمیدا کەوتبوو و دەیوت : ئەگەر تۆ لەدونیادا کۆششی منت درێژە پێداوە و لە ئاخیرەتدا بەدبەختییم درێژە پێبدەی، ئەوا تۆ منت پشتگوێ خستووە و لەبەرچاوی خۆت منت لابردووە ئەی بەخشندە .

وتی : سەلامەمان لێکرد، سەری بەرزکردەوە، زەوییەکە تەڕ بووبوو بەفرمێسکەکانی وتی : چی ئێوەی هێناوەتە ژوورەوە بۆلای من؟ !ئایا زەوی الله بۆ ئێوە فراوان نەبوو، خەڵکەکەشی هۆگرتان نەبوو؟ !
وتی کاتێ ئەوەم لە عەقڵی بینی، وتم : واللە من عاقڵی تۆم پێ باشترە لە ئاگر .
گریا و وتی : چی تۆی بێ ئومێد کردووە لەمن لە ڕەحمەتی پەروەردگار کە لە هەموو شتێکدا فراوان بووە؟
وتی : وتم : ڕەحمەتی پەروەردگار کەسی تر وەریناگرێ جگە لە اهلی دینی ئیسلام.
وتی : گریا پاشان وتی : هیچ دینێکی تر ناناسم جگە لە ئیسلام.
وتی : نەصرانییەکە پەشۆکا و وتی : ئەی مامۆستای خێر، پشت هەڵدەکەی لە دینی نەصرانیەت و مەسیح ؟
وتی : پیرە پیاوەکە چوو بەرەو ڕووی وتی : دایکت تۆی لەبارچووبێ، من لەسەر دینی مەسیح م، ئایا مەسیح دینێکی تری هەبووە جگە لە ئیسلام؟ کاتێک الله تعالی دروستکراوەکانی بەدیهێنا ڕازی بوو ئیسلام دینیان بێت، و هەرکەسێک پشت هەڵبکات لە ئیسلام هیچ بەشێکی بۆ نیە نە لەدونیا نە لە قیامەت .

وتى : نەصرانییەکە پشتى هەڵکرد و ڕۆیشت.

وتى : وتم : چاوەڕێمکە هەتا دێمە دەرەوە لەگەڵت .

وتى : ڕاهیبەکە پێى وتم : وازى لێبێنە، هەرکەسێک بەدبەختى بۆ نوسرابێ هەرگیز دڵخۆش نابێ.

وتى : وتم : الله ڕەحمت پێبکات، خەڵکیت جێشهێشتووە و لەم شوێنە نامۆ کەوتووى !

وتى : ڕاهیبەکە وتى : تۆش ئەى براکەم هەرکاتێک زانیت لەشوێنێک زیاتر نزیکتریت لە الله عَزَّ وَجلَّ، ئەوا ئەوکات ڕێچکە بگرە بۆ ئەو شوێنە، چونکە هیچ شوێنکەوتەیەک نابینیت لەو باشتر قەرەبووبکاتەوە.

وتم : ئەى خواردن ؟

وتى : پێویستى پێى کەمە.

وتم : ئەى ئەو کەمە لەکوێ بێنین ؟

وتى : ئەگەر ئەمەمان ویست ئەوا ڕووەکى زەوى و ناواخنى درەختەکان.

وتم : دەرتبهێنم لەم شوێنە سەخت و ترسناکە و بتبەم بۆ گوند و سەوزایى و گژوگیا ؟

گریا و وتى : سەوزایى و گوند بۆ کاتێکە گوێڕایەڵى پەروەردگارى تیابکرێ و منیش پیرە پیاوێکى بەتەمەنم و لە ئێستادا دەمرم و پێویستیم بەخەڵک نییە.

وتم : شتێکم پێبڵێ لەتۆوە لەبەریبکەم.

وتى : وائەکەى ؟

وتی : ان شاءالله.

وتی : هیچ شتێ هەڵمەگرە بۆ نەفسی خۆت دەربارەی خۆتەوە، و کاریگەر مەبە بەپێگە و بەشی خۆت لای خەڵکی، وە چاودێری سنوورەکانی پەروەردگاری عزَّوجلّ ـت بکە لەکاتی زاڵبوونی هەواو ئارەزوو بەسەرتدا، وە شوێن ئەو شتانە بکەوە کە خۆشیەوێت هەرچەندە لەسەرت قورس بێ بەدەستهێنانی، وە شتێکی تر پێت بڵێم لە کارەکانت مەبەستی جگە لە ئەوت نەبێ والسلام علیک.:

پاشان ڕووی لێوەرگێڕام و گریا و منیش ڕۆیشتم.

٤٤.أَخْبَرَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْحُسَيْنِ قَالَ :سَمِعْتُ أَبَا بَكْرِ بْنَ أَبِي الطَّيِّبِ رَحِمَهُ اللَّهُ يَقُولُ : بَلَغَنَا عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الْفَرَجِ الْعَابِدِ قَالَ " :احْتَجْتُ إِلَى صَانِعٍ يَصْنَعُ لِي شَيْئًا مِنْ أَمْرِ الرُّوزْجَارِيِينَ فَأَتَيْتُ السُّوقَ فَجَعَلْتُ أَرْمُقُ الصُّنَّاعَ , فَإِذَا فِي أَوَاخِرِهِمْ شَابٌّ مُصَفَّرٌ بَيْنَ يَدَيْهِ زَبِيلٌ كَبِيرٌ , وَمَرَّ وَعَلَيْهِ جُبَّةُ صُوفٍ وَمِئْزَرُ صُوفٍ فَقُلْتُ لَهُ :تَعْمَلُ؟ قَالَ : نَعَمْ , قُلْتُ :بِكَمْ؟

قَالَ :بِدِرْهَمٍ وَدَانَقٍ فَقُلْتُ لَهُ :قُمْ حَتَّى تَعْمَلَ قَالَ :عَلَى شَرِيطَةٍ , قُلْتُ :مَا هِيَ؟ قَالَ : إِذَا كَانَ وَقْتُ الظُّهْرِ وَأَذَّنَ الْمُؤَذِّنُ خَرَجْتُ فَتَطَهَّرْتُ وَصَلَّيْتُ فِي الْمَسْجِدِ جَمَاعَةً ثُمَّ رَجَعْتُ , فَإِذَا كَانَ وَقْتُ الْعَصْرِ فَكَذَلِكَ , قُلْتُ :نَعَمْ , فَقَامَ مَعِي فَجِئْنَا الْمَنْزِلَ فَوَافَقْتُهُ عَلَى مَا يَنْقُلُهُ مِنْ مَوْضِعٍ إِلَى مَوْضِعٍ , فَشَدَّ وَسَطَهُ وَجَعَلَ يَعْمَلُ وَلَا يُكَلِّمُنِي بِشَيْءٍ حَتَّى أَذَّنَ الْمُؤَذِّنُ للظُّهْرِ , فَقَالَ :يَا عَبْدَ اللَّهِ قَدْ أَذَّنَ الْمُؤَذِّنُ , قُلْتُ :شَأْنَكَ , فَخَرَجَ فَصَلَّى فَلَمَّا رَجَعَ عَمِلَ أَيْضًا عَمَلًا جَيِّدًا إِلَى الْعَصْرِ , فَلَمَّا أَذَّنَ الْمُؤَذِّنُ , قَالَ

لِي :يَا عَبْدَ اللهِ , قَدْ أَذَّنَ الْمُؤَذِّنُ قُلْتُ :شَأْنَكَ .فَخَرَجَ فَصَلَّى الْعَصْرَ ثُمَّ رَجَعَ , فَلَمْ يَزَلْ يَعْمَلُ إِلَى آخِرِ النَّهَارِ فَوَزَنْتُ لَهُ أُجْرَتَهُ وَانْصَرَفَ , فَلَمَّا كَانَ بَعْدَ أَيَّامٍ احْتَجْنَا إِلَى عَمَلٍ فَقَالَتْ لِي زَوْجَتِي :اطْلُبْ لَنَا ذَلِكَ الصَّانِعَ الشَّابَّ فَإِنَّهُ قَدْ نَصَحَنَا فِي عَمَلِنَا , فَجِئْتُ السُّوقَ فَلَمْ أَرَهُ فَسَأَلْتُ عَنْهُ فَقَالُوا :تَسْأَلُ عَنْ ذَاكَ الْمُصَفِّرِ الْمَشْؤُومِ الَّذِي لَا نَرَاهُ إِلَّا مِنْ سَبْتٍ إِلَى سَبْتٍ , لَا يَجْلِسُ إِلَّا وَحْدَهُ فِي آخِرِ النَّاسِ؟ قَالَ :فَانْصَرَفْتُ فَلَمَّا كَانَ يَوْمُ السَّبْتِ أَتَيْتُ السُّوقَ فَصَادَفْتُهُ , فَقُلْتُ لَهُ :تَعْمَلُ؟ قَالَ :قَدْ عَرَفْتَ الْأُجْرَةَ وَالشَّرْطَ؟ قُلْتُ :أَسْتَخِيرُ اللَّهَ تَعَالَى فَقَامَ فَعَمِلَ عَلَى النَّحْوِ الَّذِي كَانَ عَمِلَ , قَالَ فَلَمَّا وَزَنْتُ لَهُ الْأُجْرَةَ زِدْتَهُ , فَأَبَى أَنْ يَأْخُذَ الزِّيَادَةَ , فَأَلْحَحْتُ عَلَيْهِ فَضَجِرَ وَتَرَكَنِي وَمَضَى فَغَمَّنِي ذَلِكَ فَاتَّبَعْتُهُ وَأَدْرَكْتُهُ وَدَارَيْتُهُ حَتَّى أَخَذَ أُجْرَتَهُ فَقَطْ , فَلَمَّا كَانَ بَعْدَ مُدَّةٍ احْتَجْنَا أَيْضًا إِلَيْهِ فَمَضَيْتُ فِي يَوْمِ السَّبْتِ فَلَمْ أُصَادِفْهُ فَسَأَلْتُ عَنْهُ , فَقِيلَ لِي :هُوَ عَلِيلٌ , فَقَالَ لِي مَنْ يُخْبِرُهُ أَمْرَهُ :إِنَّمَا كَانَ يَجِيءُ إِلَى السُّوقِ مِنْ سَبْتٍ إِلَى سَبْتٍ يَعْمَلُ بِدِرْهَمٍ وَدَانَقٍ وَيَتَقَوَّتُ كُلَّ يَوْمٍ بِدَانَقٍ , وَقَدْ مَرِضَ فَسَأَلْتُ عَنْ مَنْزِلِهِ فَأَتَيْتُهُ وَهُوَ فِي بَيْتِ عَجُوزٍ , فَقُلْتُ لَهَا :هُنَا الشَّابُّ الرُّوزْجَارِيُّ , فَقَالَتْ :هُوَ عَلِيلٌ مُنْذُ أَيَّامٍ , فَدَخَلْتُ عَلَيْهِ فَوَجَدْتُهُ لِمَّا بِهِ , وَتَحْتَ رَأْسِهِ لَبِنَةٌ فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ وَقُلْتُ :لَكَ حَاجَةٌ؟ قَالَ :نَعَمْ إِنْ قَبِلْتَ , قُلْتُ :أَقْبَلُ إِنْ شَاءَ اللَّهُ تَعَالَى قَالَ :إِذَا أَنَا مُتُّ فَبِعْ هَذَا الْمُرَّ وَاغْسِلْ جُبَّتِي هَذِهِ الصُّوفَ وَهَذَا الْمِئْزَرَ وَكَفِّنِّي بِهِمَا وَافْتُقْ جَيْبَ الْجُبَّةِ , فَإِنَّ فِيهَا خَاتَمًا فَخُذْهُ ثُمَّ انْظُرْ يَوْمَ يَرْكَبُ هَارُونُ الرَّشِيدُ الْخَلِيفَةُ فَقِفْ لَهُ فِي مَوْضِعٍ يَرَاكَ فَكَلِّمْهُ وَأَرِهِ الْخَاتَمَ فَإِنَّهُ سَيَدْعُوكَ , فَسَلِّمْ إِلَيْهِ الْخَاتَمَ , وَلَا يَكُونُ هَذَا إِلَّا بَعْدَ دَفْنِي قُلْتُ :نَعَمْ , فَلَمَّا مَاتَ فَعَلْتُ بِهِ مَا أَمَرَنِي ثُمَّ نَظَرْتُ الْيَوْمَ الَّذِي يَرْكَبُ فِيهِ الرَّشِيدُ فَجَلَسْتُ لَهُ عَلَى الطَّرِيقِ , فَلَمَّا مَرَّ نَادَيْتُهُ يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ لَكَ عِنْدِي وَدِيعَةٌ وَلَوَّحْتُ

بِالْخَاتَمِ , فَأَمَرَ بِي فَأُخِذْتُ وَحُمِلْتُ حَتَّى دَخَلَ إِلَى دَارِهِ ثُمَّ دَعَانِي وَنَحَّى جَمِيعَ مَنْ عِنْدَهُ , وَقَالَ لِي :مَنْ أَنْتَ؟ فَقُلْتُ :عَبْدُ اللَّهِ بْنُ الْفَرَجِ , فَقَالَ :هَذَا الْخَاتَمُ مِنْ أَيْنَ لَكَ؟ فَحَدَّثْتُهُ قِصَّةَ الشَّابِّ , فَجَعَلَ يَبْكِي حَتَّى رَحِمْتُهُ , فَلَمَّا أَنِسَ إِلَيَّ قُلْتُ :يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ , مَنْ هُوَ مِنْكَ؟ قَالَ :ابْنِي , قُلْتُ :كَيْفَ صَارَ إِلَى هَذِهِ الْحَالِ؟ قَالَ :وُلِدَ لِي قَبْلَ أَنْ ابْتُلَى بِالْخِلَافَةِ فَنَشَأَ نُشُوءًا حَسَنًا وَتَعَلَّمَ الْقُرْآنَ وَالْعِلْمَ , فَلَمَّا وُلِّيتُ الْخِلَافَةَ تَرَكَنِي وَلَمْ يَنَلْ مِنْ دُنْيَايَ شَيْئًا , فَدَفَعْتُ إِلَى أُمِّهِ هَذَا الْخَاتَمَ وَهُوَ يَاقُوتٌ وَيَسْوِي مَالًا كَثِيرًا , فَدَفَعْتُهُ إِلَيْهَا وَقُلْتُ لَهَا :تَدْفَعِينَ هَذَا إِلَيْهِ وَكَانَ بَارًّا بِأُمِّهِ وَتَسْأَلِينَهُ أَنْ يَكُونَ مَعَهُ فَلَعَلَّهُ أَنْ يَحْتَاجَ إِلَيْهِ يَوْمًا مِنَ الْأَيَّامِ فَيَنْتَفِعَ بِهِ , وَتُوُفِّيَتْ أُمُّهُ فَمَا عَرَفْتُ لَهُ خَبَرًا إِلَّا مَا أَخْبَرْتَنِي بِهِ أَنْتَ , ثُمَّ قَالَ لِي :إِذَا كَانَ اللَّيْلُ اخْرُجْ مَعِي إِلَى قَبْرِهِ , فَلَمَّا كَانَ اللَّيْلُ خَرَجَ وَحْدَهُ مَعِي يَمْشِي حَتَّى أَتَيْنَا قَبْرَهُ فَجَلَسَ إِلَيْهِ فَبَكَى بُكَاءً شَدِيدًا , فَلَمَّا طَلَعَ الْفَجْرُ قُمْنَا فَرَجَعَ ثُمَّ قَالَ لِي :تعَاهَدْنِي فِي كُلِّ الْأَيَّامِ حَتَّى أَزُورَ قَبْرَهُ , فَكُنْتُ أَتَعَاهَدُهُ فِي الْأَيَّامِ فَيَخْرُجُ فَيَزُورُ قَبْرَهُ ثُمَّ يَرْجِعُ قَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ الْفَرَجِ :وَلَمْ أَعْلَمْ أَنَّهُ ابْنُ الرَّشِيدِ حَتَّى أَخْبَرَنِي أَنَّهُ ابْنُهُ أَوْ كَمَا قَالَ ابْنُ أَبِي الطَّيِّبِ "

٤٤ .عبدالله بن الفرج ی خواپەرست وتی : پێویستم بە کەسێک بوو شتێکم بۆ درووست بکات لەکاروباری قوڕکاریی، بۆیە چاوم دەگێڕا لە درووستکارەکان و لەکۆتاییەکەیان گەنجێکم بینی ڕەنگ زەردبوو، زەمبیلەیەکی گەورە و ماڵنج ] بۆ کاری قوڕکاریی بەکاردێت [ بەدەستیەوە بوو، چاکەتێکی خوریی لەبەربوو، وە پشتێنێکی خوریی بەستبوو،

پێم وت : کارئەکەی ؟

وتی : بەڵێ

وتم : بەچەند؟

وتی : بە درهەمێک و شەش یەکێکی.

پێم وت: هەڵسە تا کاربکەی.

وتی : بەمەرجێک.

وتم : چیە؟

وتی : کە نوێژی نیوەڕۆبوو و بانگبێژ بانگیدا دەچمە دەرەوە، دەسنوێژ هەڵدەگرم و نوێژ ئەکەم بەجەماعەت لە مزگەوت و ئەگەڕێمەوە، ئەگەر کاتی نوێژی عەسریش بێ بەهەمان شێوە.

وتم : بەڵێ.

هەڵسا لەگەڵم و چوینە ماڵ، ڕازی بووم بەوەی بیکات لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر، ناوکەمەری تووند کرد و کارەکەی خۆی کرد و هیچ قسەیەکی لەگەڵ نەدەکردم هەتا بانگبێژی نیوەڕۆ بانگیدا،

وتی : ئەی بەندەی الله، بانگبێژ بانگیدا ] مەبەستی ئەوەیە کە مەرجەکەی بیربێتەوە کەلەگەڵی ڕێکەوتبوو. ]

وتم : بە ویستی خۆت ] واتە چۆنت دەوێ لەوەی بچیتە مزگەوت و نوێژ بکەیت بەویستی خۆت بیکە. ]

چووە دەرەوە و نوێژی کرد، کە گەڕایەوە بەهەمان شێوە کارێکی باشی کرد هەتا نوێژی عەسر، پاشان بانگبێژ بانگیدا، پێی وتم : ئەی باوکی عبدالله!

وتم : به ويستى خۆت.

چووه دەرەوه و نوێژی كرد پاشان گەڕایەوه ،كاری كرد هەتا كۆتایی ڕۆژەكه، كرێكەیم بۆ هەژمار كرد و ڕۆیشت.

پاشان دوای چەند ڕۆژێ پێویستمان به كار بوو، هاوسەرەكەم پێی وتم : ئەو گەنجه داوابكەوه كارمان بۆ بكات چونكه لەكارەكەدا ئامۆژگاریی ئەكردین.

چووم بۆ بازاڕ نەمبینی، پرسیارم كرد دەربارەی،وتیان : پرسیاردەكەی دەربارەی ئەو ڕەنگ زەردە ڕەشبینەی كه نایبینین له شەممەوه بۆ شەممەیەكی تر نەبێ ؟ بەتەنها نەبێ دانانیشێ لەكۆتایی خەڵكەكه.

ڕۆیشتم، كاتێ شەممه بوو چووم و چاوم پێی كەوت، وتم : كاردەكەی ؟

وتی : زانیت كرێیەكه و مەرجەكه چییه.

وتم : پرس به الله تعالى دەكەم.

هەڵسا و كاری كرد بەوجۆرەی كه پیشەی بوو، كاتێ كرێكەیم هەژماركرد زیادم كرد، نكۆڵی كرد لەوەی زیادەكه وەربگرێ، منیش پێداگیریم كرد ئەویش تووڕەبوو، وازی لێهێنام و ڕۆیشت، منیش زۆر خەمباربووم شوێنی كەوتم، دۆزیمەوه هەتا تەنها كرێكەی خۆیم پێدا.

پاشان دوای ماوەیەك پێویستمان بەو بوو دووباره، ڕۆیشتم ڕۆژی شەممه و چاوم پێی نەكەوت، پرسیارم كرد دەربارەی، وترا : نەخۆش كەوتووه، ئەو كەسەی هەواڵی ئەوی پێدام پێی ڕاگەیاندم : دەهات بۆ بازاڕ له شەممەوه بۆ شەممه، كاری

دەكرد بە درهەمێک و شەش یەکێکی، و هەر ڕۆژێک بە شەش یەکێک لە درهەم خواردنی دەخوارد و نەخۆش کەوتووە.

پرسیارم کرد دەربارەی ماڵەکەی، چووم لە ماڵی پیرەژنێک بوو، پێم وت : ئەو گەنجە روزجاری یە.

وتی چەند ڕۆژێکە نەخۆشە، چوومە ژوورەوە بۆلای و بینیم چییەتی، لەژێر سەری خشتەی لێبوو، سەلامم لێکرد و وتم : پێویستییەکت هەیە ؟

وتی : بەڵێ ئەگەر قبووڵی بکەیت.

وتم : قبووڵی ئەکەم إن شاءالله.

وتی : ئەگەر من مردم، ئەم ئامێرە بفرۆشە و ئەم چاکەتە خوریەم بشۆ لەگەڵ ئەم پشتێنە و کفنم بکە پێیانەوە، و گیرفانی چاکەتەکەم بدڕێنە مستیلەیەکی تیایە و بیبە، پاشان چاوەڕێی ئەو ڕۆژە بکە کە خەلیفە هاڕوونە ڕەشید بە سواریی دێت، لە شوێنێک بوەستە کە بتبینێ و قسەی لەگەڵ بکە، مستیلەکەی نیشانبدە چونکە بانگهێشتت دەکات، مستیلەکەی ڕادەست بکە، بەڵام ئەمانە هەمووی لەدوای شاردنەوەم لەژێر خاک.

وتم : بەڵێ، کاتێ مرد ئەوشتانەم کرد کە فرمانی پێکردبووم، پاشان چاوەڕێی ئەو ڕۆژەم کرد کە خەلیفە هاڕوونە ڕەشید بە سواریی دێت، لەسەر ڕێگایەک بۆی دانیشتم، کاتێ تێپەڕی بانگم کرد، ئەی ئەمیری بڕوادارن لای من ئەمانەتێکت هەیە، ئاماژەم کرد بە مستیلەکە و فرمانی کرد بمبەن بردمیان و هەڵگیرام هەتا چوو بۆ ماڵەکەی، پاشان بانگی کردم، هەموو ئەوانەی لای بوون ڕۆیشتن،

پێی وتم : تۆ کێی ؟

وتم:عبدالله ی کوڕی فەرەج.

وتی : ئەم مستیلەیەت لەکوێ هێنا ؟

منیش چیرۆکی گەنجەکەم پێ وت، ئەویش گریا هەتا بەزەییم پیاهاتەوە، کاتێ دڵنەوایی هات پێم وتم : ئەی ئەمیری بڕواداران ئەو چی تۆیە ؟

وتی : کوڕمە.

وتم : ئەی چۆن گەیشت بەو بارودۆخەی ؟!

وتی : ئەم کوڕەم لێبووە پێش ئەوەی تاقیبکرێمەوە بە خەلیفەبوون، بۆیە پێگەیشتنێکی چاک پێگەیشت، قورئان و زانست فێربوو، کاتێ خیلافەتم گرتەدەست وازی لێهێنام و هیچ شتێک لە دونیاکەمی دەستنەهێنا، ئەم مستیلەیەم پێدا بەدایکی و لە مرواریيە و پارەیەکی زۆر دەکات، پێمدا و پێم وت : ئەمەی پێئەدەیت، ئەو زۆر چاکەکاربوو بەرامبەر دایکی، داوای لێدەکەیت کە پێی بێت، ڕەنگە ڕۆژێک لە ڕۆژان پێویستی پێی بێت و سوودی لێوەردەگرێ، دایکی کۆچی دوایی کرد و هیچ هەواڵێکیم لێنەزانی ئەوەنەبێ کە لەتۆوە پێم گەیشت، پێی وتم : کە شەو داهات وەرە لەگەڵم بۆ لای گۆڕەکەی، کاتێ شەوداهات

بەتەنها چووە دەرەوە و دەڕۆیشت بە پێ، هەتا ئەو کاتەی گەیشتین بە گۆڕەکەی، دانیشت لەلای، گریانێکی زۆر گریا، هەتا ڕۆژ هەڵات هەڵساین و گەڕایەوە، پاشان پێی وتم : کاتێک دابنێ هەتا هەموو ڕۆژێ سەردانی گۆڕەکەی بکەم، منیش بەشەو کاتم دانا، دەهاتە دەرەوە و سەردانی گۆڕەکەی دەکرد و دەگەڕایەوە .

عبداللە ی کوڕی فەرەج وتی : نەمدەزانی کوڕی هاڕوونە ڕەشیدە هەتا هاروونە ڕەشید پێی وتم کە کوڕیەتی، یان وەک ئەوەی ابن أبي الطيب وتی .

٤٥.قَالَ أَبُو بَكْرٍ مُحَمَّدُ بْنُ الْحُسَيْنِ :وَقَدْ حَدَّثَنِي أَبُو عَبْدِ اللَّهِ بْنُ مَخْلَدٍ الْعَطَّارُ , بِأَخْبَارِ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ الْفَرَجِ وَفِيهَا هَذَا الْحَدِيثُ عَلَى نَحْوٍ مِنْ هَذَا , وَقَالَ فِي الْحَدِيثِ : فَعَرَضَ الرَّشِيدُ عَلَى عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الْفَرَجِ مَالًا عَظِيمًا فَأَبَى أَنْ يَقْبَلَهُ.

٤٥ .محمد بن الحسين وتی : عبداللە ی کوڕی مخلد العطار پێی ڕاگەیانم هەواڵی عبداللە ی کوڕی فەڕەج، وە ئەم بەسەرهاتەی تێدایە نزیک لەم باسە.
وە لە بەسەرهاتەکەدا وتی : هاڕوونە ڕەشید ماڵ و پارەیەکی زۆری خستە بەردەمی عبداللە ی کوڕی فەڕەج ئەو نکۆڵی کرد لەوەی قبووڵی بکات .

٤٦.قَالَ أَبُو بَكْرٍ :وَبَلَغَنِي أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ الْفَرَجِ لَمَّا مَاتَ لَمْ تَعْلَمْ زَوْجَتُهُ لِإِخْوَانِهِ بِمَوْتِهِ وَهُمْ جُلُوسٌ بِالْبَابِ يَنْتَظِرُونَ الدُّخُولَ عَلَيْهِ فِي عِلَّتِهِ , فَغَسَّلَتْهُ وَكَفَّنَتْهُ فِي كِسَاءٍ كَانَ لَهُ وَأَخَذَتْ فَرْدَ بَابٍ مِنْ أَبْوَابِ بَيْتِهِ وَجَعَلَتْهُ فَوْقَهُ وَشَدَّتْهُ بِشَرِيطٍ , ثُمَّ قَالَتْ لِإِخْوَانِهِ :قَدْ مَاتَ وَقَدْ فَرَغْتُ مِنْ جِهَازِهِ , فَدَخَلُوا فَاحْتَمَلُوهُ إِلَى قَبْرِهِ وَغَلَّقَتِ الْبَابَ خَلْفَهُمْ.

٤٦ .أبو بكر وتی : وه پێم گەیشت کاتێ عبدالله ی کوڕی فەڕەج کاتێ مرد هاوسەرەکەی ڕانەسپارد بە خوشک و براکانی بلێت بە وەفاتی، ئەوان لای دەرگاکە دانیشتبوون چاوەڕێیان دەکرد بچنە ژوورەوە بۆ لای لەکاتی نەخۆشییەکەی، هاوسەرەکەی شووشتی و کفنی کرد لە پۆشاکێکدا هی خۆی بوو، دەرگایەک لە دەرگاکانی ماڵەکەی برد و خستتیە سەری و توندی کرد بە پەتێک، پاشان بە خوشک و براکانی وت مردووە و من تەواوبووم لە ئامادەکردنی، ئەوانیش چوونە ژوورەوە و هەڵیانگرت بۆ ناو گۆڕەکەی، هاوسەرەکەشی دەرگاکەی داخست لەدوای ئەوان .

٤٧ .أخبرنا محمد،قال وحدثني أبوسعيد بن الأعرابي،قال :حدثني إسحاق بن الحسن الحربي،قال:حدثني أبو عبدالرحمن البصري،قال:ثنا بن محمد بن خلاد الباهي،قال :حدثني مُؤذِّن بلهُجيم،قال:نزل سفيان الثوري رحمه اللَّه عندنا في سكننا،فكان يجلس معنا و نحن لا نعرفه،نظنُّ أنه أعرابيٌّ،و كان يُصغي إلى حديثنا،فإذا صِرنا إلى حديثه سمعنا كلاماً حسنًا يُذكِّرُنا الجنة،و يُخوِّفُنا النار،فإذا طردته الشمس حلَّ حبوته،و أنشأ يقول:

مَا ضَرَّ مَنْ كَانَ فِي الْفِرْدَوْسِ مَسْكَنُهُ ... مَا مَسَّهُ قَبْلُ مِنْ ضُرٍّ وَإِقْتَارِ
تَرَاهُ فِي النَّاسِ يَمْشِي خَائِفًا وَجِلًا ... إِلَى الْمَسَاجِدِ هَوْنًا بَيْنَ أَطْمَارٍ
تَفْنَى اللَّذَاذَةُ مِمَّنْ نَالَ صَفْوَتَهَا ... مِنَ الْحَرَامِ وَيَبْقَى الْخِزْيُ وَالْعَارُ
تَبْقَى عَوَاقِبُ سُوءٍ فِي مَغَبَّتِهَا ... لَا خَيْرَ فِي لَذَّةٍ مِنْ بَعْدِهَا النَّارُ»

٤٧ .محمد بن خلاد الباهلي وتی : بانگبێژێک لە لهجیم بۆی گێڕاینەوە کەوا سوفیانی ثەوری هاتە شوێنی دانیشتنمان، لامان دادەنیشت و ئێمە نەماندەناسی، وا گومانمان دەبرد دەشتەکی بێت، گوێی بۆ قسەکانمان دەگرت، کاتێ گەیشتین بە قسەکردنی ئەو گوێمان لە قسە گەلێکی جوان بوو بەهەشتی دەهێناوە یادمان و دەیترساندین بە ئاگر، کاتێ خۆر دەریکرد لە شوێنەکەی جلەکانی کۆکردەوە و ئەم سروودەی دەوت :

زیانی پێناگا کەسێ فیردەوس نیشتنگەی بێت
پێشتر هیچ زیانێک و تەنگییەکی پێنەگەیشتووە

لەنێو خەڵکیدا ئەیبینی ترساو و بەلەرزە
بەرەو مزگەوتەکان بەنەرم و نیانی لەنێو جلوبەرگی کەم نرخ

چێژەکانی لەناو ئەچێ بۆ کەسێ دەستیکەوتووە پوختە
لە حەڕام و سەرشۆڕیی و شوورەیی دەمێنێتەوە

چارەنوسی خراپ دەمێنێتەوە لەکۆتاییەکەیدا
هیچ خێرێک نییە لە چێژێک بەدوایدا ئاگر بێت

# ﴿ بَابٌ فِي مَوْتِ الْغَرِيبِ ﴾

# ﴿ دەروازەیەک دەربارەی مردنی نامۆ ﴾

٤٨ .أَخْبَرَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْحُسَيْنِ قَالَ :حَدَّثَنَا أَبُو الْقَاسِمِ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ الْعَزِيزِ الْبَغَوِيُّ قَالَ :حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ أَيُّوبَ الْعَابِدُ قَالَ :ثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ وَهْبٍ قَالَ : ثَنَا حُيَيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ , عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ الْحُبُلِيِّ , عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ : تُوُفِّيَ رَجُلٌ بِالْمَدِينَةِ مِمَّنْ وُلِدَ بِالْمَدِينَةِ , فَصَلَّى عَلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَقَالَ» :يَا لَيْتَهُ مَاتَ فِي غَيْرِ مَوْلِدِهِ , «فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ النَّاسِ :لِمَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ فَقَالَ : »إِنَّ الرَّجُلَ إِذَا مَاتَ فِي غَيْرِ مَوْلِدِهِ قِيسَ لَهُ مِنْ مَوْلِدِهِ إِلَى مُنْقَطَعِ أَثَرِهِ مِنَ الْجَنَّةِ«

٤٨ .عبدالله بن عمرو ـ رضي الله عنهما ـ وتی : پیاوێک مرد لەخەڵکی مەدینە کە هەر لە مەدینە لەدایک ببوو، رسول الله ﷺ نوێژی لەسەر کرد و فەرمووی : ﴿خۆزگە لە شوێنێک جگە لە شوێنی لەدایکبوونی مردبا ﴾، پیاوێک وتی : بۆچی ئەی رسول الله ؟ فەرمووی : ﴿ بەڕاستی پیاو کاتێ ئەمرێ لە شوێنێ جگە لە شوێنی لەدایکبوونی، بۆی پێوانەدەکرێ لە بەهەشت لە شوێنی لەدایکبوونییەوە هەتا شوێنی نەمانی شوێنەوارەکانی ﴾ .

٤٩.أَخْبَرَنَا مُحَمَّدٌ قَالَ :حَدَّثَنَا الْعَطَشِيُّ قَالَ :ثَنَا عَلِيُّ بْنُ الْحُسَيْنِ بْنِ عَرَفَةَ قَالَ :ثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ أَيُّوبَ , وَذَكَرَ الْحَدِيثَ.

٤٩ .محمد بن أيوب باسی حەدیسەی کردووە [ مەبەستی حەدیسی ئەثەری ٤٨ ە ] .

٥٠ .أَخْبَرَنَا مُحَمَّدٌ قَالَ :وَثَنَا أَبُو عَبْدِ اللَّهِ مُحَمَّدُ بْنُ مَخْلَدٍ الْعَطَّارُ قَالَ :ثَنَا أَبُو جَعْفَرٍ مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ قَالَ :ثَنَا مَنْصُورُ بْنُ عَمَّارٍ قَالَ :أَخْبَرَنَا ابْنُ لَهِيعَةَ , عَنْ حُيَيِّ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ الْمَعَافِرِيِّ , عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ الْحُبُلِيِّ , عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ : وَقَفَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى قَبْرِ رَجُلٍ بِالْمَدِينَةِ فَقَالَ» :يَا لَهُ لَوْ مَاتَ غَرِيبًا , «قِيلَ :وَمَا لِلْغَرِيبِ مِنَّا يَمُوتُ بِغَيْرِ أَرْضِهِ؟ فَقَالَ» :مَا مِنْ غَرِيبٍ يَمُوتُ بِغَيْرِ أَرْضِهِ إِلَّا قِيسَ لَهُ مِنْ تُرْبَتِهِ إِلَى مَوْلِدِهِ فِي الْجَنَّةِ«

٥٠ .عبدالله بن عمرو ـ رضي الله عنهما ـ فەرمووی : رسول الله ﷺ وەستا لەسەر گۆڕی مردوویەک لە مەدینە، فەرمووی : ﴿ ئای بۆ ئەوە، ئەگەر بە نامۆیی مردبا﴾.

وتیان : نامۆیەک لە ئێمە بمرێ لە جگە لە خاکی خۆی چی بۆ هەیە ؟

فەرمووی : ﴿ هەر نامۆیەک لە جگە لە خاکی خۆی بمرێ، ئیللا بۆی پێوانە دەکرێ لە بەهەشت لە خاکەکەیەوە هەتا شوێنی لەدایکبوونی﴾ .

٥١ .أَخْبَرَنَا مُحَمَّدٌ قَالَ :وَحَدَّثَنَا أَبُو عَبْدِ اللَّهِ بْنُ مَخْلَدٍ , أَيْضًا قَالَ :ثَنَا حَفْصُ بْنُ عَمْرٍو الرَّبَالِيُّ قَالَ :أَخْبَرَنَا هُذَيْلُ بْنُ الْحَكَمِ الْأَزْدِيُّ قَالَ :حَدَّثَنِي عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ أَبِي رَوَّادٍ , عَنْ عِكْرِمَةَ , عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ :قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ» :مَوْتُ الْغَرِيبِ شَهَادَةٌ«

٥١ .ابن عباس ـ رضي الله عنهما ـ فەرمووی : رسول الله ﷺ فەرموويەتی : ﴿ مردنی نامۆ شەهيدييە﴾ .

٥٢.أَخْبَرَنَا مُحَمَّدٌ قَالَ :وَحَدَّثَنَا ابْنُ مَخْلَدٍ , أَيْضًا قَالَ :حَدَّثَنِي مُوسَى بْنُ نَصْرٍ أَبُو عِمْرَانَ الْبَزَّارُ قَالَ :حَدَّثَنِي عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ نَافِعٍ أَبُو زِيَادٍ قَالَ :حَدَّثَنَا أَبُو رَجَاءٍ الْخُرَاسَانِيُّ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ الْفَضْلِ , عَنْ هِشَامِ بْنِ حَسَّانَ , عَنِ ابْنِ سِيرِينَ , عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ :قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ» :مَوْتُ الْغَرِيبِ شَهَادَةٌ«

٥٢ .أبي هريرة ـ رضي الله عنه ـ فەرمووی : رسول الله ﷺ فەرموويەتی : ﴿ مردنی نامۆ شەهيدييە﴾.

٥٣ .أَخْبَرَنَا مُحَمَّدٌ بْنِ الْحُسَيْنِ , قَالَ حَدَّثَنَا ابْنُ صَاعِدٍ قَالَ :حَدَّثَنَا الْحُسَيْنُ بْنُ الْحَسَنِ قَالَ :أَخْبَرَنَا ابْنُ الْمُبَارَكِ قَالَ :أَخْبَرَنَا ابْنُ لَهِيعَةَ قَالَ :أَخْبَرَنِي الْحَارِثُ بْنُ يَزِيدَ ,عَنْ جُنْدُبِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ الْعُدْوَانِيِّ , أَنَّهُ سَمِعَ سُفْيَانَ بْنَ عَوْفٍ الْقَارِيَّ يَقُولُ : سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرٍو يَقُولُ :كُنَّا عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمًا حِينَ طَلَعَتِ الشَّمْسُ فَقَالَ» :سَيَأْتِي نَاسٌ مِنْ أُمَّتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ نُورُهُمْ كَضَوْءِ

الشَّمْسِ , «قُلْنَا :وَمَنْ أُولَئِكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ فَقَالَ» :فُقَرَاءُ الْمُهَاجِرِينَ الَّذِينَ تُتَّقَى بِهِمُ الْمَكَارِهُ , يَمُوتُ أَحَدُهُمْ وَحَاجَتُهُ فِي صَدْرِهِ , يُحْشَرُونَ مِنْ أَقْطَارِ الْأَرْضِ«

٥٣ .عبدالله بن عمرو ـ رضي الله عنهما ـ دەيفەرموو : ئێمە لەلای رسول الله ﷺ بووین کاتێ خۆر هەڵهات، فەرمووی : ﴿لە ڕۆژی قیامەتا کەسانێک دێن لە ئوممەتەکەم ڕووناکییان وەک تیشکی خۆرە﴾.

وتمان : ئەوانە کێن ئەی رسول الله ﷺ ؟

فەرمووی : ﴿ هەژارەکان لە کۆچکردووەکان ئەوانەی کە خۆدەپارێزێ پێیان لە خراپە، کاتێ یەکێکیان دەمرێت هێشتا پێویستییەکەی لە سنگیایەتی، کۆدەکرێنەوە لە هەموولاکانی زەوی ﴾ .

[ واتە بەهۆی هەژاری و نەداریەوە چەندین ئومێد و پێویستی لە سینگیدا بوونی هەبوو بەڵام بەهۆی هەژاری و غوربەتیەوە بۆی نەهاتۆتە دی والله اعلم بالصواب ].

٥٤ .أَخْبَرَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْحُسَيْنِ قَالَ :ثنَا أَحْمَدُ بْنُ يَحْيَى الْحُلْوَانِيُّ قَالَ :حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ أَيُّوبَ الْعَابِدُ قَالَ :ثنَا مُحَمَّدُ بْنُ السَّمَّاكِ , عَنْ عَائِذِ بْنِ نُسَيْرٍ , عَنْ عَطَاءٍ , عَنْ عَائِشَةَ , قَالَتْ :قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ " :مَنْ مَاتَ فِي هَذَا الطَّرِيقِ مِنْ حَاجٍّ أَوْ مُعْتَمِرٍ لَمْ يُعْرَضْ وَلَمْ يُحَاسَبْ , وَقِيلَ لَهُ :ادْخُلِ الْجَنَّةَ"

٥٤ .دایە عائشە رضي الله عنها ـ فەرمووی : رسول الله ﷺ فەرموویەتی : ﴿ هەرکەسێ بمرێ لەم ڕێگایە لە حاجی، و لە عومرەکار ئەوا کردەوەکانی نیشان نادرێتەوە و حسابی لەگەڵ ناکرێ، پێی دەووترێت بڕۆ بەهەشتەوە﴾.

٥٥ .أَخْبَرَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْحُسَيْنِ , قَالَ وَحَدَّثَنِي أَبُو عَبْدِ اللَّهِ بْنُ مَخْلَدٍ قَالَ :ثَنَا عَلِيُّ بْنُ حَرْبٍ الطَّائِيُّ قَالَ :حَدَّثَنِي حُسَيْنُ بْنُ عَلِيِّ الْجُعْفِيُّ , عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ السَّمَّاكِ , عَنْ عَائِذٍ , عَنْ عَطَاءٍ , عَنْ عَائِشَةَ , عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِثْلَهُ.

٥٥ .له دايه عائشه رضي الله عنها .له پێغەمبەرەوە بەهەمان شێوە.

٥٦ .أَخْبَرَنَا مُحَمَّدٌ قَالَ :وَثَنَا ابْنُ مَخْلَدٍ قَالَ :حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ يَسَارٍ الْبَزَّارُ , عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ الْحُسَيْنِ , صَاحِبِ الرَّقَائِقِ قَالَ :حَدَّثَنِي الصَّلْتُ بْنُ حَكِيمٍ قَالَ :حَدَّثَنِي أَبُو زَيْدٍ , رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الْبَحْرَيْنِ قَالَ " :غَسَّلْتُ مَيِّتًا بِالْبَحْرَيْنِ , فَإِذَا مَكْتُوبٌ عَلَى لَحْمِهِ :طُوبَاكَ يَا غَرِيبُ :قَالَ :فَذَهَبْتُ أَنْظُرُ فَإِذَا هُوَ بَيْنَ الْجِلْدِ وَالْعَظْمِ"

٥٦ .أبو زيد .كە پیاوێک بووە لە بەحرەین .وتی : مردوویەکم شوشت لە بەحرەین، لەسەر گۆشتەکەی نوسرابوو : ﴿ خۆشبەختیی بۆ تۆ ئەی نامۆ ﴾.
چووم سەیری بکەم بینیم لەنێوان پێست و گۆشتەکەی بوو .

٥٧ .قَالَ أَبُو بَكْرٍ :أَنْشَدَنِي مُحَمَّدُ بْنُ الْقَاسِمِ بْنِ الْحَسَنِ السَّرَّاجُ قَالَ :أَنْشَدَنِي أَبُو جَعْفَرِ بْنُ الصَّفَّارِ:

نَمْ عَلَى سِرٍّ وَجْدَهُ النَّفْسُ ... فَالدَّمْعُ مِنْ مُقْلَتَيْهِ مُنْبَجِسُ

مُدَلَّهٌ وَالِهٌ لَهُ حَرَقٌ ... أَنْفَاسُهُ بَالْحَنِينِ تَخْتَلِسُ

يَا بَابِي وَجْهَهُ الْجَمِيلَ الَّذِي ... يَفُوقُ وَجْهَ الْمُدَلَّلِ الْمُلْسِ

يَا بَابِي، جِسْمُهُ الزَّكِيُّ وَإِنْ ... كَانَ عَلَيْهِ خَلِيقُ دَنَسٍ

إِنْ مَاتَ فِي غُرْبَةِ الْغَرِيبِ فَقَدْ ... نَاحَ عَلَيْهِ الضِّيَاءُ وَالْغَلَسُ

"

٥٧ .أبوبكر وتى : محمد بن القاسم بن الحسن السراج سروودى بۆ وتم و وتى : أبوجعفر بن الصفار سروودى بۆ وتم :

بخەوە لەسەر خۆشى و خۆشبەختى نەفست

فرمێسک لە پێڵووى چاوەكان قەتیس ماوە

عەقڵى ڕۆیشتووە لە خۆشەویستیدا برینى هەیە

هەناسەكانى تێكەڵ بووە بە سۆز

واوەیلام بۆی ڕووخسارە جوانەکەی
کە لەجوانیدا سەرووی ڕووخساری منالێکی نەرم و نۆڵە

واوەیلام بۆی لاشە بۆنخۆشەکەی گەرچی
جلێکی دڕاو و پیسی لەبەر بێت

بەڕاستی مردنی نامۆ لە غوربەتیدا ئەوا
ڕووناکی کۆتایی شەو بۆی ئەگرییێت

٥٨ .قَالَ أَبُو بَكْرِ مُحَمَّدُ بْنُ الْحُسَيْنِ :فَإِنْ قَالَ قَائِلٌ :فَكُلُّ مَنْ مَاتَ غَرِيبًا يَكُونُ مَوْتُهُ شَهَادَةً عَلَى ظَاهِرِ الْخَبَرِ , قِيلَ لَهُ :الْغَرِيبُ عَلَى وَجْهَيْنِ:

أ .فَغَرِيبٌ يَمُوتُ طَائِعًا لِلَّهِ عَزَّ وَجَلَّ بِغُرْبَتِهِ , وَهُمْ عَلَى أَصْنَافٍ شَتَّى , كُلُّهَا مَحْمُودَةٌ فَهُمُ الَّذِينَ يُرْتَجَى أَنْ يَكُونَ مَوْتُ أَحَدِهِمْ شَهَادَةً.

ب.وَغَرِيبٌ عَاصٍ لِلَّهِ تَعَالَى بِغُرْبَتِهِ وَهُمْ عَلَى أَصْنَافٍ شَتَّى كُلُّهَا مَذْمُومَةٌ , وَفُرِضَ عَلَيْهِمُ التَّوْبَةُ مِنَ الْغُرْبَةِ وَالرُّجُوعِ عَمَّا تَغَرَّبُوا لَهُ.

٥٨ .محمد بن الحسين وتی : ئەگەر قسەکەرێک وتی:

هەرکەسێک بە نامۆیی بمرێت مردنەکەی شەهیدیە لەسەر ڕووکەشی هەواڵەکە؟ پێی دەوترێ : نامۆ لە دوو ڕووەوەیە :

أ .نامۆیەک دەمرێ گوێڕایەڵە بۆ اللە عَزَّ وَجلَّ بە نامۆییەکەی، وە ئەوان چەند پۆلێکی جیاوازن، گشتیان سوپاسکراون، ئەمان ئەوانەن کە ئومێد دەکرێ مردنی یەکێکیان شەهیدیی بێت .

ب .نامۆیەک سەرپێچیکارە لە اللە عَزَّ وَجلَّ بە نامۆییەکەی، وە ئەوان چەند پۆلێکی جیاوازن، گشتیان زەمکراون، وە فەرزە لەسەریان تەوبە بکەن لە نامۆییەکەیان و بگەڕێنەوە لەو شتەی بۆی نامۆ کەوتوون .

٥٩ .فَإِنْ قَالَ قَائِلٌ :فَصِفْ لَنَا الْغَرِيبَ الطَّائِعَ لِلَّهِ عَزَّ وَجَلَّ بِغُرْبَتِهِ , حَتَّى لَا نَتَغَرَّبَ إِلَّا فِي طَاعَةِ اللَّهِ :

-قِيلَ لَهُ مَنْ تَغَرَّبَ فِي حَجٍّ أَوْ فِي عُمْرَةٍ أَوْ جِهَادٍ , فَمَاتَ فِي خُرُوجِهِ أَوْ رُجُوعِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ.

-وَمَنْ خَرَجَ فِي طَلَبِ عِلْمٍ يُرِيدُ وَجْهَ اللَّهِ الْكَرِيمَ بِعِلْمِهِ لِيَعْلَمَ مَا افْتَرَضَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ عَلَيْهِ فَيَسْتَعْمِلُهُ , وَيَعْلَمُ مَا حَرَّمَ اللَّهُ تَعَالَى عَلَيْهِ فَيَنْتَهِي عَنْهُ , فَمَاتَ فَهُوَ شَهِيدٌ.

-وَمَنْ خَرَجَ زَائِرًا لِأَخٍ فِي اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ أَوْ لِزِيَارَةِ رَحِمٍ يَبَرُّهُمْ بِزِيَارَتِهِ فَمَاتَ فَهُوَ شَهِيدٌ.

-وَمَنْ كَانَ بِبَلَدٍ فَظَهَرَتْ فِيهِ الْفِتَنُ فَخَشِيَ عَلَى دِينِهِ وَمَالِهِ وَأَهْلِهِ فَفَرَّ مِنْهُ إِلَى بَلَدٍ غَيْرِهِ فَمَاتَ فَهُوَ شَهِيدٌ.

-وَمَنْ ضَاقَ عَلَيْهِ الْكَسْبُ الْحَلَالُ فِي بَلَدِهِ فَخَرَجَ إِلَى بَلَدٍ غَيْرِهِ لِيَكْتَسِبَ الْحَلَالَ فَمَاتَ فَهُوَ شَهِيدٌ.

-وَمَنْ شَرَدَ لَهُ وَلَدٌ أَوْ أَبَقَ لَهُ عَبْدٌ أَوْ أَمَةٌ فَخَرَجَ فِي طَلَبِهِمْ فَمَاتَ فَهُوَ شَهِيدٌ.

٥٩ .ئەگەر قسەکەرێک وتی : بۆمان وەسف بکە نامۆیەکی گوێڕایەڵ بۆ الله عَزَّ وَجلَّ بەنامۆییەکەی، هەتا نامۆ نەکەوین تەنها بۆ گوێڕایەڵی الله عَزَّ وَجلَّ نەبێ.
پێی دەوترێ:

. هەرکەسێ نامۆ بکەوێ لە حەج و عومرە و جیهاد، هەرکەسێ بمرێ لەکاتی دەرچوونی یان گەڕانەوەی ئەوا شەهیدە.

.هەرکەسێ دەرچوو بۆ داواکردنی زانست، مەبەستی لە

داواكردنی زانستەکەیدا ڕووی الله عَزَّ وَجلَّ بێت تاوەکو فێربێت الله عَزَّ وَجلَّ چی لەسەر فەرز کردووە تا بەکاریبێنێ، یان فێربێت الله عَزَّ وَجلَّ چی لەسەر حەرام کردووە تاوەکو وازی لێبێنێ، کاتێ مرد ئەوا شەهیدە.

. وە هەرکەسێ دەرچوو وەک سەردانیکەر بۆ برایەکی لەپێناوی الله عَزَّ وَجلَّ یان سەردانیکردنی ناسیاوێکی لەسەردانیکردنەکەیدا چاکەکاربێ بۆیان، بمرێ شەهیدە .

. هەرکەسێ لە وڵات و شارێکدا بوو فیتنەکان تیایدا دەرکەوتن، ئەویش ترسا لە دین و ماڵەکەی و خاو و خێزانی، لێی ڕاکرد بۆ جگە لەو شار و وڵاتە، کاتێ مرد شەهیدە .

. هەرکەسێک دەستهێنانی کاروکاسبی حەڵاڵ بۆی تەنگ بوو لە وڵات و شارەکەی خۆی و دەرچوو بۆ جگە لە شار و وڵاتی خۆی بۆ پەیداکردنی حەڵاڵ، کاتێ مرد شەهیدە.

. هەرکەسێک مناڵەکەی بەڕەڵابوو یان بەندەکەی هەڵات لەژێردەستی ئەمیش چووە دەرەوە تاوەکو بیاندۆزێتەوە، بمرێ شەهیدە .

٦٠ .وَأَمَّا صِفَةُ مَنْ تَغَرَّبَ فِي مَعْصِيَةٍ , مِثْلَ:

-أَنْ يَقْطَعَ الطَّرِيقَ عَلَى الْمُسْلِمِينَ -.أَوْ أَنْ يُعِينَ الْخَوَارِجَ.

-أَوْ خَرَجَ يَسْعَى فِي الْأَرْضِ لِلْفَسَادِ.

-أَوْ خَدَعَ وَلَدًا لِرَجُلٍ أَوْ عَبْدًا أَوْ أَمَةً فَهَرَبَ بِهِمْ , فَتَغَرَّبَ.

-أَوْ خَرَجَ فِي تِجَارَةٍ مُحَرَّمَةٍ لَا يُبَالِي مَا نَقَصَ مِنْ دِينِهِ إِذَا سَلِمَتْ لَهُ دُنْيَاهُ.

فَهَؤُلَاءِ وَمَا يُشْبِهُ أَمْثَالَهُمْ عُصَاةٌ لِلَّهِ عَزَّ وَجَلَّ بِتَغَرُّبِهِمْ وَفَرَضَ عَلَيْهِمُ التَّوْبَةَ وَالرُّجُوعَ عَنْ قَبِيحِ مَا خَرَجُوا لَهُ , فَإِنْ مَاتُوا فِي غُرْبَتِهِمْ لَمْ تُحْمَدْ أَحْوَالُهُمْ.

٦٠ .ئەمما سیفەتی ئەو کەسەی نامۆ بووە لەپێناوی تاوان و سەرپێچی اللّٰه عَزَّ وَجلَّ وەکو :

[واتە بۆ نمونە کەسانێک دەچنە ولاتێک نامۆن، کەس ناناسن لەوێدا نەکەسیش ئەوان دەناسێت، نامۆبوونەکەیان بەهۆی دینەوە نیە بۆیە سەرپێچیکارن ].

.دەرچوون لەپێناوی ڕێگەگرتن لە مسوڵمانان .

.ياخود بۆ هاوكاریكردنی خەواریج.

.ياخود دەرچێت لەپێناو هەوڵدان بۆ خراپەكاریی لە زەوی .

. ياخود منالّی پياوێكی فريودابێ، يان بەندەيەک يان خزمەتكارێک، ڕفاندوونی پاشان نامۆ كەوتووە .

. ياخود دەرچووە بۆ بازرگانييەكی حەرامكراو گوێنادات چی لە دينەكەی كەم دەكات كاتێ دونياكەی سەلامەت بێ .

ئەمانە و هاوشێوەكانيان سەرپێچيكارن بۆ الله تعالى لە نامۆبوونەكەياندا، فەڕزە لەسەريان تەوبە بكەن و بگەڕێنەوە لە ناشرينی ئەو شتەی لەپێناويدا دەرچوون، ئەگەر بمرن لەو نامۆييەدا حاڵ و بارودۆخيان ستايشكراو نابێت.

٦١ .أَخْبَرَنَا مُحَمَّدٌ قَالَ :أَخْبَرَنَا أَبُو بَكْرٍ عُمَرُ بْنُ سَعْدٍ الْقَرَاطِيسِيُّ , قَالَ :ثَنَا أَبُو بَكْرٍ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدِ بْنِ عُبَيْدٍ الْقُرَشِيُّ قَالَ :ثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْحُسَيْنِ قَالَ :حَدَّثَنِي زَكَرِيَّا بْنُ أَبِي خَالِدٍ , قَالَ " :خَرَجَ فَتًى يَطْلُبُ الدُّنْيَا فَتَعَذَّرَتْ عَلَيْهِ فَكَتَبَ إِلَى أُمِّهِ :سَأَكْسَبُ مَالًا أَوْ أُرَى فِي ضَرِيحَةٍ مِنَ الْأَرْضِ لَا يَبْكِي عَلَيَّ سَكُوبٌ وَلَا وَالِهٌ، حَرَّى عَلَيَّ حَزِينَةٌ ,

وَلَا أَحَدَ مِمَّنْ أُحِبُّ قَرِيبٌ سِوَى أَنْ يَرَى قَبْرِي غَرِيبٌ , فَرُبَّمَا بَكَى إِنْ يَرَى قَبْرَ الْغَرِيبِ غَرِيبٌ، قَالَ : فَوَافَى الْكِتَابُ وَقَدْ مَاتَتْ أُمُّهُ , فَأَجَابَتْهُ خَالَتُهُ:

سأكسِبُ مالاً أو أُرى في ضريحةٍ...من الأرض لا يَبكي عليَّ سَكوبُ
ولا والِهٌ حرّى عليَّ حزينةٌ...ولا أحدٌ ممَّن أُحِبُ قَريبُ
سوى أن يرى قبري غريبٌ،فَرُبَّما...بكى أن يرى قبر الغريبِ غريبُ
فوافى الكتاب وقد ماتت أمه،فأجابته خالته،]فقالت: [
تَذَكَّرْتُ أَحْوَالًا وَأَذْرَيْتُ عَبْرَةً ... وَهَيَّجْتَ أَحْزَانًا فَذَاكَ عَجِيبُ
فَإِنْ تَكُ مُشْتَاقًا إِلَيْنَا فَإِنَّنَا ... إِلَيْكَ ظَمَاءٌ وَالْحَبِيبُ حَبِيبُ
فَامْنُنْ عَلَى أُمٍّ عَلَيْكَ شَفِيقَةٌ ... بَوَجْهِكَ لَا تَثْوَى وَأَنْتَ غَرِيبُ
فَإِنَّ الَّذِي يَأْتِيكَ بِالرِّزْقِ نَائِيًا يَجِيءُ ... بِهِ وَالْحَيُّ مِنْكَ قَرِيبُ

٦١ .زكريا بن ابي خالد وتی : گەنجێک دەرچوو داوای دونیا بکات، کاتێ قورس بوو لەسەری، بۆ دایکی نووسی :

سامانێک پەیدا ئەکەم یان لەناو دارەمەیتدا ئەبینرێم
لە زەوییەکدا ناگری لەسەرم ئەوەی ئەمخاتە ناوی

نەهیچ خەمبارێک خەمم بۆ ئەخوات
نەهیچ کەسێک لەوانەی خۆشمدەوێن نزیکن

مەگەر تەنها نامۆیەک گۆڕەکەم ببینێ و ڕەنگە
بگری کاتێ نامۆ گۆڕی نامۆیەکی تر ببینێ

کتێبەکەی تەواوکرد و دایکی مردبوو، پوری وەڵامیداوە (وتی):

حاڵ و بارێکت یادکردەوە و فرمێسکت ڕشت
خەمێکت وروژاند و ئەمەش سەرسوڕهێنەرە

گەر تۆ پەرۆش بیت بۆ ئێمە ئەوا بەڕاستی ئێمە
تینوین بۆ تۆ و خۆشەویست خۆشەویستە

تۆش منەت بکە بەسەر دایکێکدا بەبەزەییە بەرامبەرت
لە خاکێکدا مەمێنەوە تیایدا نامۆ بیت

چونکە ئەوەی ڕزقت دەدات لە دوور
هەر ئەوە ڕزقت بۆ دێنێت لەکاتێکا لە گەڕەکەکەتەوە نزیکیت

كتاب السلف

٦٢.أَخْبَرَنَا مُحَمَّدٌ قَالَ :أَنْشَدَنَا أَبُو حَفْصٍ عُمَرُ بْنُ جَعْفَرٍ الطَّبَرِيُّ لِبَعْضِ الْحُكَمَاءِ:

زَعَمَ الَّذِينَ تَشَرَّقُوا وَتَغَرَّبُوا ... أَنَّ الْغَرِيبَ وَإِنْ أَعَزَّ ذَلِيلُ
فَأَجَبْتُهُمْ أَنَّ الْغَرِيبَ إِذَا اتَّقَى ... حَيْثُ اسْتَقَلَّ بِهِ الرِّكَابُ خَلِيلُ
قَالُوا الْغَرِيبُ يُهَانُ قُلْتُ تَجَلَّدَا ... إِنَّ الْإِلَهَ بِنَصْرِهِ لَكَفِيلُ
قَالُوا الْغَرِيبُ إِذَا يَمُوتُ بِبَلْدَةٍ ... لَمْ يُبْكَ أَوْ يُسْمَعْ عَلَيْهِ عَوِيلُ
قُلْتُ الْغَرِيبُ كَفَاهُ رَحْمَةُ رَبِّهِ ... وَغِنَى الْبُكَاءِ عَلَى الْفَقِيدِ قَلِيلُ

٦٢ .محمد هەواڵی پێداین وتی : سروودی بۆ وتم أبو حفص عمر بن جعفر الطبري بۆ هەندێ لە داناکان :

وا گومان دەبەن ئەوانەی ڕوویان کردۆتە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا
بەڕاستی نامۆ ئەگەرچی بەعیزەت بێ زلیلە

وەڵامم دانەوە : بەڕاستی نامۆ ئەگەر پارێزکاربوو
لەهەرجێگایەک کاروانەکەی جێگیربوو بەڕێزە

وتیان : نامۆ بەکەم دادەنرێ، وتم : ئارام دەگرێ
پەروەردگاری بۆ سەرکەوتنی کەفیلە

وتيان : نامۆ کاتێ دەمرێ لە شارەکەی
هیچ کەسێ نابیستی بگری بۆی و دەنگی ناڵە نایەت

وتم : نامۆ ڕەحمەتی پەروەردگاری بۆی بەسە
پێویستی گریان لەسەر کەسێکی لەدەستچوو کەمە

٦٣ .قَالَ أَبُو بَكْرٍ :أَنْشَدَنِي بَعْضُ الْمِصْرِيِّينَ مِنْ أَصْحَابِنَا لِبَعْضِ الْحُكَمَاءِ:

تَغَرَّبْتُ عَنْ أَهْلِي فَظَلْتُ مُشَرَّدًا ... وَحِيدًا طَرِيدًا فِي الْبِلَادِ أَدُورُ
وَخَلَّفْتُ إِخْوَانِي وَأَهْلِي وَجِيرَتِي ... يَنُوحُونَ شَجْوًا إِنَّنِي لَصَبُورُ
وَلِي وَطَنٌ مَا إِنْ عَلَى الْأَرْضِ مِثْلُهُ ... وَلَكِنْ مَقَادِيرُ جَرَتْ وَأُمُورُ

٦٣ .محمد بن الحسين وتی : سردوویان بۆ وتم هەندێ لە میصریەکان لە هاوڕێکانمان بۆ هەندێ لە داناکان :

نامۆبووم لەکەسوکارم بەبێ لانە مامەوە
تاک و بەتەنیا لە شارەکان ئەسوڕێمەوە

لەدوامەوە براکانم و بنەماڵەکەم و هاوسێکەم جێهێشت

ناڵەو گریان دەكەن بەپەرێشانی، بەڕاستی من ئارامگرم

من نیشتمانێكم هەیە لەسەر زەویدا هاوشێوەی نیە
بەڵام قەدەرەكان و كارانێک دەڕۆن

٦٤.قَالَ مُحَمَّدُ بْنُ الْحُسَيْنِ :أَغْرَبُ الْغُرَبَاءِ فِي وَقْتِنَا هَذَا:

-مَنْ أَخَذَ بِالسُّنَنِ وَصَبَرَ عَلَيْهَا.

-وَحَذِرَ الْبِدَعَ وَصَبَرَ عَنْهَا.

-وَاتَّبَعَ آثَارَ مَنْ سَلَفَ مِنْ أَئِمَّةِ الْمُسْلِمِينَ.

-وَعَرَفَ زَمَانَهُ وَشِدَّةَ فَسَادِهِ وَفَسَادَ أَهْلِهِ , فَاشْتَغَلَ بِإِصْلَاحِ شَأْنِ نَفْسِهِ مِنْ حِفْظِ جَوَارِحِهِ , وَتَرْكِ الْخَوْضِ فِيمَا لَا يَعْنِيهِ وَعَمِلَ فِي إِصْلَاحِ كَسْرَتِهِ.

-وَكَانَ طَلَبُهُ مِنَ الدُّنْيَا مَا فِيهِ كِفَايَتُهُ وَتَرْكُ الْفَضْلِ الَّذِي يُطْغِيهِ.

-وَدَارَى أَهْلَ زَمَانِهِ وَلَمْ يُدَاهِنْهُمْ , وَصَبَرَ عَلَى ذَلِكَ , فَهَذَا غَرِيبٌ وَقَلَّ مَنْ يَأْنَسُ إِلَيْهِ مِنَ الْعَشِيرَةِ وَالإِخْوَانِ , وَلَا يَضُرَّهُ ذَلِكَ.

٦٤ .محمد بن الحسين .رحمه الله .وتی :

نامۆترین نامۆ لەم کاتەدا بریتین لە:

.هەرکەسێ دەست بە سونەتەوە بگرێ، وە ئارام بگرێ لەسەری.

. ئاگاداری بدات دەربارەی بیدعە، وە ئارام بگرێ لەسەری.

.شوێنی ئەوانە بکەوێت کە لە پێشینانن لە ئیمامە مسوڵمانەکان.

. زەمانەکەی خۆی دەناسێ [واتە چی تیایدا دەگوزەرێ، چ بیدعەیەک زۆر بڵاوە تاکو حەزەڕی لێبکات، یاخود خراپیەکانی خەڵکەکە تاکو خۆی لێ بپارێزێت]، وە زۆری خراپەکارییەکەی، وە خراپەکاری بنەماڵەکەی [کاتێ کەسێک دەست دەگرێت بەسوننەتەوە لەهەموو شوێنێک هەوڵی خراپ کردنی دەدەن نزیکترین کەسیش بۆ ئەو بنەماڵەکەیەتێ بۆیە ئەبێ زۆر ئاگاداری ئەو خراپیانە بێت کە بنەماڵەکەی دەیانەوێت تووشی بکەن بۆ ئەوەی پارێزراو بێت]، بۆیە بێ پێویست دەبێ بەوەی چاکسازی بکات لە کاروباری نەفسی خۆی لە پاراستنی ئەندامەکانی لاشەی، وە وازدێنێت لە قسەکردن لەشتێکا کە پەیوەندی بەوەوە نییە، وە کاردەکات بۆ چاککردنی شکاویەکانی.

ـ وه داواكردنی بۆ دونیا بەو ڕاددەیە كە بەسیبێ و وازدێنێت لە بەدەست هێنانی گەورەییەكەی كە وای لێدەكات سنور ببەزێنێت.

ـ (مداراة) ی خەڵكی سەردەمی خۆی دەكات و (مداهنة) یان ناكات،وە ئارام دەگرێت لەسەر ئەمە، ئا ئەمە نامۆیە، كەم دڵخۆش دەبن پێی لە هۆز و برایان، بەڵام ئەمە هیچ زەرەر لەو نادات.

٦٥ .فَإِنْ قَالَ قَائِلٌ :افْرُقْ لَنَا بَيْنَ الْمُدَارَاةِ وَالْمُدَاهَنَةِ , قِيلَ لَهُ:

الْمُدَارَاةُ الَّتِي يُثَابُ عَلَيْهَا الْعَاقِلُ , وَيَكُونُ مَحْمُودًا بِهَا عِنْدَ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ , وَعِنْدَ مَنْ عَقَلَ عَنِ اللَّهِ تَعَالَى هُوَ الَّذِي يُدَارِي جَمِيعَ النَّاسِ الَّذِينَ لَا بُدَّ لَهُ مِنْهُمْ , وَمِنْ مُعَاشَرَتِهِمْ لَا يُبَالِي مَا نَقَصَ مِنْ دُنْيَاهُ , وَمَا انْتُهِكَ بِهِ مِنْ عِرْضِهِ بَعْدَ أَنْ سَلِمَ لَهُ دِينُهُ , فَهَذَا رَجُلٌ كَرِيمٌ غَرِيبٌ فِي زَمَانِهِ .

وَالْمُدَاهَنَةُ :فَهُوَ الَّذِي لَا يُبَالِي مَا نَقَصَ مِنْ دِينِهِ إِذَا سَلِمَتْ لَهُ دُنْيَاهُ , قَدْ هَانَ عَلَيْهِ ذَهَابُ دِينِهِ وَانْتِهَاكُ عِرْضِهِ , بَعْدَ أَنْ تَسْلَمَ لَهُ دُنْيَاهُ , فَهَذَا فِعْلُ مَغْرُورٍ , فَإِذَا عَارَضَهُ الْعَاقِلُ فَقَالَ :هَذَا لَا يَجُوزُ لَكَ فِعْلُهُ قَالَ :نُدَارِي فَيَكْسُو الْمُدَاهَنَةَ الْمُحَرَّمَةَ اسْمَ الْمُدَارَاةِ , وَهَذَا غَلَطٌ كَبِيرٌ مِنْ قَائِلِهِ , فَاعْلَمْ ذَلِكَ.

٦٥ .ئەگەر قسەکەرێک وتی :
جیاوازیمان بۆ بکە لەنێوان المداراة و المداهنة،
پێی دەوترێ:

**المدارة** ئەوەیە کە کەسی عاقڵ لەسەری پاداشت دەدرێتەوە، وە بەوەوە سوپاسکراوە لەلایەن اللە عَزَّ وَجلَّ وە لای ئەوانەی عاقڵ بوون دەربارەی اللە عزَّ و جل، ئەو کەسە مداراةی هەموو ئەوانە دەکات کەوا گومانی تێدانیە کە پێویستە مداراةیان بکرێن،وە لە مامەڵە لەگەڵ کردنیشیان، گوێ بەوە نادات کە چەند کەم دەکات لە دونیاکەی و چەند دەستدرێژی بکرێتە سەری،لە دوای ئەوەی کە دینەکەی سەلامەت بێت، ئا ئەمە پیاوێکی بەخشندە و نامۆیە لە زەمانی خۆی.

**المداهنة** : ئەوەیە کە گوێ بەوە نادات چەند کەم دەکات لە دینەکەی کاتێ دونیای سەلامەت بێ،ئاسان بووە لەسەری ڕۆیشتنی دینەکەی و دەستدرێژی کردنە سەر ناموسی، دوای ئەوەی دونیای سەلامەت بێ، ئەم کردارە کردارێکی مغرورە.

وە کاتێ کەسێکی عاقل ڕێگری بوو لەمە، دەڵێ : ئەم کردارە بۆت درووست نیە بیکەیت.
دەڵێ : ئێمە مداراة دەکەین،بەمە ناوی مداراة دەکەن بەبەرگی مداهنةی حەرامکراو،ئەمەش هەڵەیەکی زۆرگەورەیە بزانە.

٦٦ .قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ :مُدَارَاةُ النَّاسِ صَدَقَةٌ.

٦٦ .پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : مدارة ی خەڵک صەدەقەیە .

٦٧.وَقَالَ الْحَسَنُ :الْمُؤْمِنُ يُدَارِي وَلَا يُمَارِي , يَنْشُرُ حِكْمَةَ اللَّهِ , فَإِنْ قُبِلَتْ حَمِدَ اللَّهَ وَإِنْ رُدَّتْ حَمِدَ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ.

٦٧ .الحسن وتی : ئیماندار مداراة دەکات مشتومڕ ناکات،دانایی اللە بڵاودەکاتەوە.ئەگەر قبوڵکرا ئەوا سوپاسی اللە دەکا، ئەگەر ڕەتی کردەوە هەر سوپاسی اللە عَزَّ وَجلَّ دەکا.

٦٨ .وَقَالَ مُحَمَّدُ ابْنُ الْحَنَفِيَّةِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ :لَيْسَ بِحَكِيمٍ مَنْ لَمْ يُعَاشِرْ بِالْمَعْرُوفِ لِمَنْ لَا يَجِدُ مِنْ مُعَاشَرَتِهِ بُدًّا , حَتَّى يَجْعَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ لَهُ مِنْهُ فَرَجًا وَمَخْرَجًا .

قَالَ أَبُو بَكْرٍ : فَمَنْ كَانَ هَكَذَا فَهُوَ غَرِيبٌ طُوبَى لَهُ ثُمَّ طُوبَى لَهُ.

٦٨ .محمد بن الحنفية . رحمه الله . وتی : دانا نیە ئەو کەسەی کە فرمان ناکات بەچاکە بەرامبەر ئەو کەسانەی کە گومانی تیانیە پێویستە وابکات بەرامبەریان .تاوەکو اللە عَزَّ وَجلَّ ڕزگاربوون و دەرچەیەکی بۆ دێنێت.

كتاب السلف

أبو بكر وتى : هەركەسێ ئا بەم شێوەیە بێ ئەوە نامۆیە، خۆشبەختى بۆ ئەو، پاشان خۆشبەختى بۆ ئەو.

کۆتایي کتێب کە ناونراوە بە ﴿ غرباء ﴾
لە کۆتاییەکەی :

گوێم لە یەحیای کوڕی معاذی رازي بوو دەیوت : ئەی نەوەی ئادەم داوای دونیات کرد داواکردنی کەسێک کە گومانی تیانیە پێویستی بێ، قیامەتت داواکرد وەک داواکردنی کەسێک کە پێویستی پێی نیە، دونیا بەشی پێویستت بوو ئەگەرچی داواشت نەکردبا، وە دوارۆژیش بەداواکردنی خۆت بەدەستی دێنیت، بۆیە عەقل بەکاربێنە بۆ کاروبارت.

هەروەها یەحیا وتى : ئەی نەوەی ئادەم، بەهەشت دەورەدراوە بە ناخۆشی و تۆ ڕقت لێیەتی، و جەهەننەم دەورەدراوە بە ئارەزووەکان و تۆ داوای دەکەیت، تۆ تەنها وەک نەخۆشێکی کە نەخۆشیەکەی زۆر قورسە، ئەگەر نەفست ئارامگرت بە چەشتنی ئازارەکانی دەرمانەکە ئەوا بە ئارامگرتنەکەت سەرەنجامی شیفاوەرگرتن بەدەست دێنیت.

وە ئەگەر نەفست ئارامگرنەکرد بەرامبەر ئەو ئازارانەی بەهۆی وەرگرتنی دەرمانەکەوە تووشت دەبێ ئەوکات نەخۆشییەکەت درێژە دەکێشێ.

تەواوكرا بە حەمد و یارمەتی و منەت و بەخشندەیی الله، لەسەر دەستی بەندەی لاواز، ئومێدەواری ڕەحمەت و لێخۆشبوونی پەروەردگاری، محمد بن طولو بُغا السيفي، ئەمەش لە ڕۆژی یەكشەممە، ٢٤ی ربيع الآخر، ساڵی ٧٣٣، بەتەنیشتی مزگەوتی سیفي لە دیمەشقی پارێزراو بە فریشتەكان، و الحمدلله.

وصلى وسلم على نبينا محمد

الحمدلله یاالله كە منەتی خۆت كردووە بەسەرمان و ئەمجارەش ئەم كتێبە تەواو بوو، الله لە غەریبان هەژمارمان بكات بەفەزڵی خۆی وە هەر هەر بەغەریبیش بگەڕێینەوە لای ئەو.

الله پاداشتی تەواو بەو كەسانە بدات كە بە وشەیەكیش یارمەتیان داین، هەم لەڕەخنە هەم لە پێشنیار، الله بە إخلاصەوە لێمان قبوڵ بكات و بیكاتە مایەی سوود بۆ ئەم ئومەتە.

"اللَّهُمَّ انْفَعْنِي بِمَا عَلَّمْتَنِي، وَعَلِّمْنِي مَا يَنْفَعُنِي، وَزِدْنِي عِلْمًا"

"اللَّهُمْ اجْعَلْ عَمَلِي كُلَّهُ صَالِحَاً وَاجْعَلْهُ لِوَجْهِكَ خَالِصَاً وَلا تَجْعَلْ لِأَحَدٍ فِيهِ شَيْئَاً"

كتاب السلف

**"اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْعَجْزِ وَالْكَسَلِ، وَالْجُبْنِ وَالْبُخْلِ وَالْهَرَمِ، وَعَذَابِ الْقَبْرِ، اللَّهُمَّ آتِ نَفْسِي تَقْوَاهَا، وَزَكِّهَا أَنْتَ خَيْرُ مَنْ زَكَّاهَا، أَنْتَ وَلِيُّهَا وَمَوْلَاهَا، اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عِلْمٍ لَا يَنْفَعُ، وَمِنْ قَلْبٍ لَا يَخْشَعُ، وَمِنْ نَفْسٍ لَا تَشْبَعُ، وَمِنْ دَعْوَةٍ لَا يُسْتَجَابُ لَهَا."**